2010





پۆڵ ستراتێرن

وەرگێڕانی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

# ساتێک لەگەڵ ئەفلاتون

زنجیرەی ناسینی فەیلەسوفەکان

٣

# ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی

# سایە

ناونیشان: سلێمانی – سابونکەران – تەنیشت شوقەکانی تەکیە رووتە

٠٧٧٠٢١١٩٥٦٤ - ٠٧٧٠١٥٥٠٨٥٣

# ساتێك
# لەگەڵ ئەفلاتون

**پۆل ستراتێرن**

وەرگێڕانی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

چاپی یەکەم ــ سلێمانی

٢٠١٠

# پێڕست

بابەت ـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــ لاپەڕە

سائێك لەگەڵ ئەفلاتون

ناسنامەی کتێب/

ناوی کتێب: سائێك لەگەڵ ئەفلاتون

نووسینی: پۆل ستراتێرن

وەرگێڕانی بۆ فارسی: مەسعود عولیا

وەرگێڕانی بۆ کوردی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

تایپ: ئانیتا

چاپ: یەکەم ٢٠١٠

چاپەمەنی: سایە

ساڵی چاپ: ٢٠١٠

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٢٠٠٠

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی ( ١١٩٠) ی ساڵی ( ٢٠١٠ ) ی پێ دراوە.**

ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوە سایە – بۆ پەیوەندی – ٠٧٧٠٢١١٩٥٦٤ – ٠٧٧٠١٥٥٠٨٥٣

## پێشەکی

ئایا ئەفلاتون بووە هۆی لەناوچوونی فەلسەفە، یان لانیکەم هەندێ لە بیرمەندەکانی سەردەم وایان دەرخستووە کە ئەفلاتون وا پیشان بدرێت. نیچەو هایدگێر هەردووکیان بڕوایان وایە کە فەلسەفە بە هۆی سوقراتو ئەفلاتون لە پێش سەدەی پێنجەمی پێش زایین دەسکەوتی پێشکەش نەکرد. دوو سەدەی رابردوو فەلسەفە جوولەی لێکەوتبوو. لە هەندێ بوارەوە بە زەحمەت هەنگاوی هەڵهێنابوو، بەلام لێرەدا (واتە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین) وا پیشاندرابوو کە رێگاکەی بە هەڵە بڕیوە..

سوقرات هیچ نووسینێکی لە خۆی بەجێنەهێشت. سەرچاوەی سەردکی زانیاریەکانمان سەبارەت بەو، کەسایەتیەکی نیوە مێژووییە کە لە قسەکردنەکانی ئەفلاتوندا دەردەکەوێت. زۆرجار دژوارە دەست نیشانی بکەین لە چ کاتێکدا ئەم کەسایەتیە خەریکی دەربڕینی بیروڕایەتی کە خودی سوقرات دەریبڕیوە، یان لە زاری ئەفلاتونەوە رۆڵ دەگێڕێت. لە هەر دوو شێوەدا، ئەم دۆخە لە ریشەوە جیاواز بوو لەگەڵ ئەو فەیلەسۆفانەی کە پێش ئەو دەژیان (کە ئێستاکە لە لای خەڵك بە پێش سوقراتیەکان ناسراون).

لەوڕووەوە سوقراتو ئەفلاتون چۆن پێش ئەوەی فەلسەفە لە سەر بنەمای چۆنیەتیو دەبێ فەلسەفە چۆن بێت دەستی پێکردبێت، بەرەو لەناوچوونی برد؟ لە رواڵەتدا کێشەکەی ئەمە بوو کە فەلسەفە بە

خۆیدا کۆ بکاتەوەو پێکی بهێنێت. وا هاتە ئارا کە ئەم شاکارە دژوارە بیرمەندییە، کاریگەریی سەقامگیری خۆی لە سەر بیرکردنەوە فەلسەفییەکانی بەجێ بهێڵێت.

فیساغۆرس ساڵی ٥٨٠ ی پێش زایین، لە دوورگەی ساموّس لە دایك بوو، بەلام بە دەست داگیرکاری ناوچەییەوە هەڵهات، پاشان لە (کروتۆن) کە ناوچەی داگیرکراو و ژێردەستی یۆنانی لە باشووری ئیتالیا بوو، قوتابخانە فەلسەفیو بیرکاریەکەی بنیات نا. لەوێ پێڕێستێکی دوور و درێژی یاسای داهێنا کە بۆ قوتابیو لاینگرانی بیری خۆی بە سوود بێت. ئەوانە لە پاڵ گەمارۆکانی تردا بە راشکاوی بەربەستیان بۆ دانرابوو، بۆ نموونە لە نێوان ئەوەیا مابوونەوە کە ئایا بهێڵن پەرەسیلکەکان لە بنمیچەکەدا هێلانە بکەن یا ئایا پێش سەرەتا نان لەت بکەن یان فاسۆلیاکە بخۆن. جیا لەوەش لە ژێر کاریگەری هیچ بیرۆکەیەکدا، هیچ کام لەوانە نەیدەتوانی گۆشتی سەگەکەی خۆی بخوات. ئەرەستۆ وتەنی، فیساغۆرس توانی چەندین پەرجۆ بکات: هەرچەند ئەرەستۆ بە پێچەوانەی رێسا، وردەکاریی لەوبارەیەوە نەوتووە. بە رای (برتراند راسێڵ)، فیساغۆرس "تێکەلاوێکە لە ئەنشتاینو خاتوو (ئەدی)" بنیاتنەری کڵێسای زانستی مەسیحی بوو- ئەمە گرۆپێکی مەسیحین کە بڕوایان وایە نوێژ بە تەنهایی دەتوانێ چارەسەری نەخۆشیەکان بکات.)

بە داخەوە ئەو زنجیرە دەسەلاتە گەورانەی کە فیساغۆرس هەیبوو، نەیتوانی هاولاتیانی (کروتۆن) بگۆڕێت. دەرئەنجام ئەوانە لەم

کارێکی ژیرانه دەژمێردرێت. دەرکەوتنی شیکردنەوەو هۆکارهێنانەوە هەموو شتێك خاپوور دەکات.

بەلاّم ئەم شێوە نەریتەی پێش سوقرات چی بوو کە دەرکەوتنی ژیری ئەوەی تێکشکاند؟ فەیلەسوّفەکانی پێش سوقرات هەندێ کەسی بەرجەستە بوون کە پرسیاری قوولّو بیرمەندانەیان لە هەر شێوەیەك دەردەخست: "راستی لە چیدایە؟"، "بوون چییە؟"، "هەبوون چییە؟"، هەندێ لەم پرسیارانە لە لای زۆربەی فەیلەسوّفەکان بە بێ وەلاّم ماوەتەوە(ئەم راستیە، ئەو رێژە فەیلەسوفە مۆدێرنانە لە خۆ دەگرێت لە سەر ئەو بنەمایە کە ناکرێ پرسیاری لەمشێوەیە بدرێتەوە، بە گشتی نایەنە کایە).

"فیساغۆرس"، سەیروسەمەرەترین فەیلەسوّفی پێش سوقراتی بووە. ئەمڕۆکە فیساغۆرس زیاتر لە هەموو شتێك بە هۆی ئەو مەسەلەیە کە بە ناویەتی لە ناو خەلّکی دا ماوەتەوە "کۆی رەگی دوو جای دوو سووچی گۆشە وەستاو یەکسانە بە رەگی دوو جای ژێ ی سێگۆشەیەك". چەندین سەدەیە ئەم مەسەلەیە بۆ زۆربەی خەلّك یەکەم دەسکەوتی بیرکاریی بەلایانەوە ساکار کردووە. فیساغۆرس، قوولّترین کاریگەری لە سەر بیری ئەفلاتون بە جێهێشتو بۆ پەیاکردنی زۆربەی سەرچاوەکانی ئەفلاتون دەبێ بەرەو ئەو سەرچاوەیە برۆین.

فیساغۆرس تەنها سەرچاوە نەبوو. جیا گەوەش توانی رۆلّی پێشەوای فەلسەفی، بیرکاریزانو راوێژکاری خۆراکی بە یەکجاری لە کەسایەتیی

قسەکەی فیساغۆرس بە قووڵی کاریگەری لە سەر بیری ئەفلاتون دانا کە "هەموو شتێك ژمارەیە". ئەم قسەیە کلیلی بیرکردنەوەی فەلسەفی تەواوی فیساغۆرسە کە بە هەمان رادە کە کاریگەر بوو، قووڵایی هەبوو. فیساغۆرس بڕوای وابوو کە لەوپەڕی جیهانی شڵەژاوی هێماکان، جیهانێکی تر واتە جیهانی هاوئاهەنگی ژمارەکان دانراوە. لە راستیدا وێنای ئەو سەبارەت بە ژمارە کە ئێمە بە شێوە دایدەنین، نزیکترە. بە رای فیساغۆرس، شتۆمەکی مادی لە مادە دروست نەکراون، بەڵکو دوایین بەشیان، وێناو شێوەو پێکهاتەیە. ئەم شتۆمەکانە لە وێناو شێوەکان دروست کراون. جیهانی نموونەیی، ژمارە، یان شێوەی هاوئاهەنگو راستەقینەیە. دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان ژمارەو هارمۆنی مۆسیقایی، دەسکەوتی فیساغۆرس یان فیساغۆرسیەکان بوو. بە هۆی ئەم دۆزینەوە باشە، بیرۆکەی فیساغۆرس سەبارەت بە شێوە یان ژمارە، ئەوەندە لە راستیەوە دوور نیە. هەر بەوجۆرە کە بە هۆی فیزیاوە دیاردەکانی ناوەوەی ناوك، کە لە بری پاڵدانەوەیان بە وەسفی بنەمایی، بە ئاسانی دەلکێن بە شماردو وەسفی پەیوەست بە شێوەو وێناوە، بیرۆکەیەکی وا ئەوەندەش لە راستیەکانەوە دوور نیە.

ئەمجۆرە بیرکردنەوە نابنەمایە یەکێکە لە تایبەتمەندییە ئاساییەکانی بیرکردنەوە لە سەردەمی پێش سوقراتیدا. بۆ نموونە، (هراکلیتۆس) لاینگری فیساغۆرس بڕوای وابوو هەموو شتێك لە هاتوچووی بەردەوامدایە. رایگەیاند "هیچ کەس دووجار هەنگاو نانێتە ناو رووبارێکەوە." سەرەڕای هەموو ئەمانەش سەیر لەمەدایە ئەم قسەیە

فێرکارییانە هیلاك بوونو فیساغۆرس ناچار بوو جارێکی تر، هەڵبێت. پاشان لە شاری (متاپونتۆ) یان متاپونتۆم سەقامگیر و نیشتەجێ بوو. هەر لەوێدا نزیکەی ساڵی ٥٠٠ی پێش زایین مرد. فێرکارییەکانی فیساغۆرس بۆ ماوەی سەد ساڵی تر لە لوتکەی پشکواندنو پەرەپێدانو رەواج دا بوو، بە دەستی لاینگرانو بیرمەندانی دەوروبەری، بیرکاریو بیرۆکەکانی لە سەرانسەری باشووری ئیتالیاو یۆناندا بلاو بوودوە. لەمرودوە ئەفلاتون ئەو هەلەی بۆ رەخسا تا فیساغۆرس بناسێت.

هەروەها فیساغۆرس هەر وەك سوقرات دوورەپەرێزی کردو شتێکی نەنووسی. فێرکاریەکانی تەنها لە رێگای قوتابیەکانیەوە بە دەستمان گەیشتووە. ئێستاکە بۆمان روون بووەتەوە کە قوتابیەکانی فیساغۆرس هۆکارو بنەمای بەشێکی زۆر لە بیرۆکەو بیرکاریو فەلسەفەو بیرمەندیو رێسا بوون کە ئەمرۆکە ناوی "قوتابخانەی فیساغۆرس"یان لە سەر دانراوە. لە راستیدا مەسەلەی بەناوبانگی فیساغۆرس سەبارەت بە رەگی دوو جای (ژێ) بە ئەگەری زۆر بە دەستی خودی فیساغۆرس نەدۆزراوەتەوە. (ئەم وتەیە بەو واتایەیە کە خودی فیساغۆرس مەسەلەی فیساغۆرسی نەدەزانی، ئەمەش بۆ ئەو کەسانە کە بیرکاری نازانن، هۆکاری دلگەرمیو هیوایە).

وەرگێڕی کوردی: رەنگە ئەم بیرۆکەیەش هەڵە بێت، چونکە مێژوو لەمبارەیەوە دوو لایەنەیە.

* * *

هاتنی بیرۆکەی (دموکریتۆس(مان پێدەڵێت کە فەیلەسوفێکی تری پێش سوقراتییەو ئەو ئاگادارییەمان پێدەدات کە هێمای بیرکردنەوەی "بنەمای رەسەن"ە. دموکریتۆس لە سەر ئەم بیرۆکەیە پێداگر بوو کە جیهان لە ناوکەکان دروست کراوە. لە راستیدا زیاتر لە دوو هەزار ساڵ پێش ئەوەی زاناکانی ئەمرۆ بڕیار بدەن کە بیرکەکەی ئەو رەوا بوو، ئەو کات گەیشتووەتە ئەنجامێکی وا. هەروەها فەیلەسوفەکان بەو رادەیەش کاتیان تەرخان کردووە تا بگەنە ئەو ئەنجامە کە (کسنۆفانێس)ی ئەیۆنیایی، فیلسوفی پێش سوقراتی پێی گەیشتبوو. بە راشکاوی رایگەیاند: "هیچ کەس راستیەکان سەبارەت بە خواوەندەکان و لەبارەی شتەکانی ترەوە نازانێت و هەرگیز لەوەش تێناگات، چونکە ئەگەر رووبدات و کەسێك شانس لەگەڵیدا بێت و راستییەکان بدرکێنێت، خۆی لێی بێ ئاگا دەبێت." ئەم قسەیە بە شێوەیەکی سەیر هاوشێوەیە لەگەڵ بیرۆکەکانی (وینگنێشتاین) لە سەدەی بیستەمدا کە درکاندبووی.

ئەو نەریتە فەلسەفییە بەهرەدارەو جۆراوجۆرەی کە ئەفلاتون تیایدا پەروەردە کرا بەمشێوەیە بوو.

## ژیانو بەرهەمەکانی ئەفلاتون

ئەفلاتون زۆرانبازێکی بەناوبانگ بوو، ئەم ناوەش کە ئەمڕۆکە بەوە دەیناسین نازناوێکە کە لە گۆڕەپانی کێبڕکێدا پێیدرابوو. وشەی ئەفلاتون بە واتای (پان) یان لووسکەیە، ئەگەری زۆری هەیە مانای یەکەمیان راست بێت، چونکە دەڵێن شانی پان بووە، هەندێ کەسیش دەڵێن ناوچاوانی پان بووە. ئەفلاتون کاتێك لەساڵی ٤٢٨ی پێش زایین لە دایك بوو، ناوی (ئەریستۆکلێس)یان لە سەر دانا. لە ئەسینا یان لە دوورگەی (ئەگینا) لە دوانزە کیلۆمەتری کەناری دەریای ئەسینا لە بەندەری سارۆنیك لە دایك بوو. ئەفلاتون لە بنەماڵەیەکی سیاسەتمەداری گەورەی ئەسیناییدا چاوی هەڵێنا. باوکی ناوی (ئاریستۆن) بوو لە تایفەی (کدورۆس) کە دوایین پاشای ئەسینا بوو، دایکی لە تایفەی (سولۆن) بوو کە یاسادانەرێکی گەورەی ئەسینایی بوو.

وەك هەموو ئەندامانی زیرەکی تری بنەماڵەکە کە خاوەنی سیاسەتن، یەکەمین وێناو خەیاڵە بەرزە فڕیەکانی ئەفلاتون لە بوارەکانی تردا پشکوان جیا لە سیاسەت. دوو جار لە یارییەکانی ناوچەی (تەنگە)دا

دەرکردبوو کە لە وشەیەکی یۆنانی دێرین بە واتای گفتوگۆ یان کێبڕکێ لە سەر باسێك وەرگیراوە (دیالێکتیك بە واتای: زار، شێوەزارە- dialect.) سوقرات هانی قوتابیەکانی دەدا تا سەبارەت بە باسێك، شیکارییەکی تایبەت بخاتەڕوو، ئنجا دەستی دەکرد بەوەی ئەو پرسیارە شیبکاتەوەو رەخنەی لێبگرێت: کەموکوڕی ئەو شیکاریەی دەدۆزیەوە، خاڵە باشەکانی دەست نیشان دەکرد، هەندێ شتی بۆ زیاد دەکردو هەندێ پێشنیاری بۆ دەکرد، بۆ نموونە مەسەلەکەی ئاوەڵا دەکردەوەو باسی زیاتری لە سەر دەکرد.

وێناکردنی چۆنیەتی زۆر باشی داهێنەرانەی ئەم شێوازە کە بە قووڵی پشتی بە بنەمای ژیری بەستبوو، بە لامانەوە دژوارە. فەلسەفە پێش سوقرات یان هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ژیریدا نەبوو یان پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژیریدا کەم بوو. زۆرجار پێش سوقراتیەکان ئارەزوویان بەرامبەر بە هەندێ مەسەلە پیشان دەدەن وەك: هەبوون-بنەوانەی سروشتیی هەموو بوونەوەرەکان – یان چۆنیەتی بنیاتی خودی جیهان کە (بیر لەوە بکەیتەوە دەکرێ جیهان لە ئاو یان ئاوك دروست کرابووبێت). هەندێ لەم بەڵگانە یان ناوەڕۆکی شڵەژاو و بڵاوە لە سەر ئەو بنەمایە کە ئەم پێی گەیشتبوو، بە شێوەیەکی سەیر راست بوو، بەڵام سوقرات توانی تێبگات کە فەلسەفە ناتوانێت لەم ئاراستەیەدا بۆ پێشەوە بڕوات. فلەیلەسوفەکان پێش ئەم دۆخە، ببوونە گاڵتەجاڕ و کەرەسە، بەڵام هیچ هۆکارێك لە ئارادا نەبوو کە خودی فەلسەفە تا ئەم ئاستە بڕواتە پێشەوە. ئەگەر وابوایە کە

خـەڵاتی یەکـەمی زۆرانبـازی بـە دەسـت هێنـا (ئـەو یارییانـەی کـە لـە تەنگەی کورینتی یۆناندا بەڕێوە دەچوو)، بەڵام وادیار بـوو هـەرگیز لـە یارییەکانی ئۆڵەمپیکی ئۆڵەمپیاکاندا هیچ خەڵاتێکی بە دەست نەهێنا. لە بری ئەوە دەستی کرد بە هۆنراوە نووسین تا ببێتـە تراژیـدیانووس، بەڵام نەیتوانی لە هیچ یەك لەم یارییە گرنگانەدا، سەرنجی داوەرەکـان بـۆ لای خـۆی رابکێـشێت. پـاش ئـەوە نـەیتوانی ئـەو خـەڵاتی ئـاڵتۆنی کێبڕکێیەکانی ئۆڵەمپیك بە دەست بهێنێت، یان ئەو خەڵاتەی کە یۆنان داینـابوو بەرامبـەر بـە خـەڵاتی ئێـستای نـۆبێل- ی ئەمڕۆییـە، لانیکەم بـەوە رازی بـوو کـە بـە تـەواوی ببێتـە کەسایەتیەکی بەرجەسـتەی حکومی. پاشان وەك دوایین ئاری تازەلاویەتی بڕیـاری دا شانـسی خـۆی لە فەلسەفە تاقی بکاتەوە، ئنجـا بڕیـاری دا گـوێ لـە قـسەکانی سـوقرات بگرێت.

ئەفلاتون لە یەکەم بینین دا سوقراتی بـە بـاش زانـیو خۆشـی ویـست. لەو کاتە بە دواوە بۆ ماوەی نۆ ساڵ گوێی لە قسەکانی مامۆستای خـۆی گرتو تا ئەو رادەیە بۆ لوا، بیرۆکەکانی سـوقراتی بـە مێـشکی راسـپارد. شـێوازە فێرکاریـەکانی سـوقرات کـە تایبەتمەندییـەکی کێبڕکێیانـەی هەبوو، قوتابیەکانی هاندەدا تا لە هەموو توانا ژیرییـەکانیان تێبگـەنو لە هەمان کاتدا روانگەیانی بەرامبەر بە فەلسەفە روون کردەوە.

شـێوازی فێرکـاریی سـوقرات لـە سـەر بنـەمای گفتوگۆ و وتوویـژ بـوو، شـێوازێك کـە وردە وردە ئـەو مەسـەلەی بـەر باسـە شـیدەکرایەوەو وردەکـاری لـە سـەر دەکـرا. ئـەم شـێوازە بـە "دیالێکتیـك" ناوبـانگی

ـەو دەسـەڵاتە دروسـت بـوو، دەیتـوانی کەسـایەتیەك وەك (ماکیـاوێلی) یان (ئەستالین) بێنێتە ئارا، سەرەڕای ئەمانەش ئەفلاتون نەکەوتە ژێر کاریگەریـەوە. پـاش ئـەوەی دیموکراتـەکان دەسـەڵاتیان گرتـە دەسـت، مامۆسـتا خۆشەویـستەکەی ئـەفلاتون، واتـە سـوقرات بـە هـۆی ئـەوەی تۆمەتی لادان لە ئاینیان خستە پاڵو وتیـان گەنجـەکان بـەرەو فەسـادی دەبات، دادگاییـان کـردو سزای مردنیـان بـە سـەردا سەپاند. پـاش ئـەو ڕووداوە دیمۆکراسی لـە ڕوانگـەی ئـەفلاتون تووشـی کـەموکوڕیو هەڵـە بوو کە لە حکومەتی دیکتاتۆریدا بوونی هەبوو.

پەیوەنـــدیی نزیکـــی ئـــەفلاتون لەگـــەڵ ســـوقرات خـــستیە دۆخێکـــی مەترسیدارەوە، ئەفلاتۆن بە ناچار بەرژەوەندیی خۆی لەوەدا بینی کە لە ئەسینا کۆچ بکات. لەمڕووەوە گەشتەکانی ئەفلاتون دەستی پێکرد کە دوانزە ساڵی خایاند. تا ئەو ڕادەیە هەستی دەکرد لە مامۆستاکەی شت فێر بووە، ئیتر دەستی کرد بە فێربوون لە شتەکانی تری جیهان، بـەڵام لـەو ڕۆژگـارەدا جیهـان ئەوەنـدە بـەربڵاو نـەبوو، هـەروا ئـەفلاتون لـە قۆناخی یەکەمی تاراوگەیدا لەگەڵ هاوڕێیەکەیدا بـە نـاوی ئوقلیـدۆس-ی (مگـارایی) دەسـتی بـە توێژینـەوە کـرد، مگـارا شـوێنێکە دراوسـێی ئەسینا کـە بیـست کیلۆمـەتر لـەولای ئەسـینایە. (ئـەم ئوقلیدۆسـە ئـەو ئوقلیدۆسـە بیرکاریزانـە بەناوبانگـە نـەبوو، بـەڵکو قوتابییـەکی کـۆنی سوقرات بـوو کـە بـە هـۆی دیـالێکتیکی وردبینانـەی خۆیـەوە ناوبـانگی دەکردبـوو. ئوقلیـدۆس ئەوەنـدەی حـەزی لـە بیرکردنـەوەی سـوقرات هەبوو کە لە کاتی مەراسیمی ناشتنی تەرمەکەیدا کە لەو کاتە ئەو دوو

بیرکردنـەوەی فەلـسەفی بگۆڕایـە بـە گاڵتەیـەکی ژیرانـە یـان لادان لـە بیرۆکـەی ئـاینیو بەربەسـت بکرایـە، پێویـستی بـە دۆخێکـی روونـتر و وردبـین تـر هـەبوو. شـێوازی دیـالێکیتیی سـوقرات ئـەم پێویـستییەی چارەسـەر کـرد. ئێـستا بـە هـۆی تێپـەڕبوونی دوو هـەزار سـاڵ پیاچـوونەوەی ئەندێـشەکانو بیرکردنـەوە لـە رابـردووی بیرۆکـەکان دەتـوانین ئـەم شـێوازە بـە پێـشەنگی مـەنتقی دابـنین کـە ئەرەسـتۆ قوتابیەکەی ئەفلاتون پاش سەدەیەك یان هەر لەم کاتەدا ئەوەی بنیات نا.

ئـەفلاتون بـە هـۆی ئـەم شـێوازەوە هێمـای قۆنـاخێکی دروسـتکردنی چـارەنووس بـوو لـە ئـاڵۆگۆڕی فەلـسەفەدا، هێمنەکەشـی ئـەوە بـوو کـە ئـەفلاتون قوتابیـەکی تێگەیـشتووی وانـەی بـوو، چـونکە سـوقرات دەسـکەوتی هـەبوو هـەروا قوتابیەکـەی تێگەیـشتنی هـەبوو. بـۆ تێگەیشتنی تەواوی ئەم پێشکەوتنە، تەنها ئەوەندەی پێویـستە باسێکی گرنگی ژیرانە وێنا بکەین کە تیایدا هیچ هۆکارێك نەیەتە ئارا.

ئـەفلاتون بـەو هۆیـەوە کـە پیـشەی راستەقینەی خـۆی دۆزیبـووەوە، دیـسانەوە راڕایـی بـووەوە تـا لـە دۆخێکـی قەیراناویـدا بگەڕێتـەوە بـۆ رابردووی ناخۆشی خۆیو هەنگاو بنێتە ناو جیهانی ناخۆشی سیاسەت. بەختەوەرانە هەڵسوکەوتی پیاوانی حکومی ئەسینا لەم کارە دووریـان خستەوە. کاتێك پاش شەڕی پولوپۆنزی، سی کەسی زاڵم دەسەلاتیان گرتە دەست، دوان لەو رێبەرانە (کریتیـاسو خارمیـدەس) لـە خزمـانی ئەفلاتون بوون. ئەو حکومەتـە توندوتیـژەی کـە پـاش بـە دەستهێنانی

خستەڕوو. ئەو لە روخساری کەسێکدا کە بەرامبەرەکەی بە وتۆوێژ لە خشتە دەبات، کەسێکی کارامە دەرکەوتووە، بەڵام لە کۆتاییدا کەسێکی خۆشەویستو ناوێتەیەك بووە لە پیرۆزیو دۆخێکی قۆشمەیی لە فەلسەفەدا، لەم دیاردەیەدا کاریگەریەکی تایبەت لە خۆی بە جێدەهێڵێت.

لانیکەم سێ قۆناخ لە وتووێژە سەرەکیەکانی ئەفلاتون بە ناوی : بەرگری، کریتۆنو ئووتیفرۆن، وتۆوێژی لەگەڵ (فایدۆن)دا کە لە ریزی بەرهەمەکانی دوایی ئەفلاتوندایە، تایبەت کراوە بە رۆژانی بەندیخانەی سوقراتو دەرەنجام مردنی سوقرات. ئەم رووداوە کاریگەریەکی قووڵی لە سەر بوونی ئەفلاتون بەجێهێشتو ئەو وەسفەی کە ئەفلاتون خستوویەتە روو، هاوسەنگو بەراوەردە لەگەڵ (هەملێت)و (دۆزەخ)ەکەی دانتە لە ئەدەبیاتی رۆژئاوادا. "بەرگری"، دادگاییەکەی سوقراتو بەرگری فەیلەسوفێکی هەفتا ساڵەیە لە خۆی لە بەرامبەر خەڵکی ئەسینادا. بە بێ لارەملی، لە چوارچێوەی بەرگریی یاسایی یان تەنانەت رازیکەر پەسەند ناکرێت. سوقرات بەو تۆمەتانەی خستیانە پاڵی کە هۆکارەکەشی لە بەرچاو نەگرتنی دۆخی ئەو کاتە بوو، بەرامبەری وەستایەوەو بەرەو لای مەسەلەی سەرنجراکێش تر رۆیشت. وەك ئەم مەسەلەیە کە بۆچی ئەو بە کەسێکی زانا ژمێردرابوو. بڕوای وابوو ژیانی بە تەواوی لە ئاراستەی رۆڵ یان ئەرکێك دەگەڕێت کە جیهان پەسەندی بکات کە سوقراتی بە زاناترین کەسی لە سەر زەوی بناسێت. سوقرات لە سەرەتاوە گوێی بەم

ولاتە دوژمنی یەك بوون_ هاتۆچوو قەدەغە بوو، لەو کاتەدا بە جل‌و بەرگی ژنانەوە چوو بووە ئەوێ. چونکە مگارا و لەگەڵ ئەسینادا دوژمنایەتیان هەبوو.

ئەفلاتون بۆ ماوەی سێ ساڵ لەگەڵ ئوقلیدۆسدا لە مگارا مایەوەو پاشان بەرەو (کورنە) بەڕێکەوت لە باشووری ئەفریقا تا لەگەڵ (تیۆدورۆس)ی بیرکاریزان کاری توێژینەوەو لێکۆڵینەوە دەست پێبکات. پاش ئەم ماودیە وادیارە کە ئەفلاتون گەشتێکی بۆ میسر کردووە. لە سەر بنەمای ئەو مێژووە کۆنەی دەیگێڕنەوە لەم کاتەدا حەزی کرد کە لەگەڵ هەندێ لە موغەکان لە ناوچەی رۆژهەلاتی دەریای سپی دا چاوپێکەوتن بکات‌و لە رۆژهەلاتدا واتە لە کەنارەکانی رووباری گونگ کۆتایی بە گەشتەکەی بێنێت، بەلام دوورە کە ئەم مێژووە راست بێت.

ئەگەری زۆری هەیە ئەفلاتون لە کاتی نیشتەجێبوونی لە (مگارا) یان لە کاتی وەستان‌و حەسانەوەی لە گەشتەکانیدا، یەکەم بەرهەمەکانی نووسیوە کە ئێستا لە بەر دەستماندایە. ئەم بەرهەمانە لە چوارچێوەی گفتوگۆدا نووسراون‌و کاریگەری سوقراتیان پێوە دیارە. سەرەڕای ئەمانەش ئەفلاتون بە تەواوی کاریگەریی سوقراتی لە سەر نەبووە. ئەم وتووێژانە خولقاندنی مێشکێکی داهێنەرانەن کە گەیشتووەتە لوتکەو جیا لە فەلسەفەش لە چوارچێوەی ئەدەبیات دا بە بەرهەمێکی زۆر گرنگ دەژمێردرێت. لە زۆربەی وتووێژەکاندا سوقرات لە چوارچێوەی کەسایەتیەکی سەرەکی دا دەرکەوتی‌و ئەندێشەکانی خۆی

ئالتۆنی، لەوروودوە بینینی ئەو شوێنە وێنایەکی فێرکاری لە دۆخو مەسەلەی ژیانی جیهانی پاش مردن دەخاتەڕوو، بەڵام قوپکەی بورکانەکە بە لای ئەفلاتونەوە تەنانەت زیاتر لە هەموو شوێنەکان سەرنجڕاکێش تر بوو، ئەوەش بە هۆی پەیوەندیی بورکانەکە لەگەڵ (ئەمپدۆکلێس)ی فەیلەسوف و هۆنراوەبێژی سەدەی پێنجەمی پێش زایین بوو. ئەمپدۆکلێس هێزی ژیری و بیرۆکەکانی ئەوەندە بەهێز بوو کە دەرەنجام لەوە دڵنیا بووەوە کە لە ریزی خواوەندەکاندایەو بۆ سەلماندنی ئەم بیرۆیەکەش خۆی خستبووە ناو پریشکە بەتینەکانی قوپکەی ئەم بورکانەوە.

گرنگتر لەوەش ئەفلاتون لەوێدا پەیوەندییەکی باشی گرت لەگەڵ لاینگرانی فیساغۆرس کە لە سەرانسەری ناوچە بندەستەکانی یۆنانی سیسیل و باشووری ئیتاڵیادا پەرەی سەندبوو. دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان ژمارەو هاوئاهەنگیی مۆسیقایی بە دەستی فیساغۆرس، ئەفلاتونی بەرەو ئەم بیرۆکەیە راکێش کرد کە کلیلی تێگەیشتن لە کەون لە دەستی ژمارەکاندایە. دەکرێ هەموو شتێك لە سەر بنەمای ژمارەکان- کە لە چوارچێوەی ئەوپەڕی شتەکانی جیهانی ئەمڕۆدایە، دیاری بکرێت. ئەم بیرۆکەیە کاریگەرییەکی قووڵی لە سەر بیرۆکەی ئەفلاتون بەجێهێشت و گەیشتە ئەو ناستە کە بڕوای وابوو راستیەکی بنەڕەتی جیایە لە مادە. ئەو شتانەی لە سەرەتاوە بە شێوەی ژمارەکان لە لای فیساغۆرسەوە دەرکەوت، لە فەلسەفەی ئەفلاتوندا بە شێوەی وێنا، یان بیرۆکەی رەسەن دەرکەوت.

مەسەلانە نەدابوو کە قسەکەی (سروشی دۆڵفی) لە بەر چاو نەگرتبوو، چونکە هیچ شتێکی نەدەزانی. بۆیە دەستی بە پرسیار کردبوو لەو کەسانەی کە ناوبانگیان بە زانا دەرکردبوو، لەوە تێگەیشتبوون کە لە راستیدا ئەمانە هیچ نازانن. ئەمەش نموونەیەکی کلاسیکییە لە شێوازی دیالێکتیك، بە کارهێنانی فەلسەفە بۆ گۆڕینی بیرکردنەوەی دۆخی ئێستا کە بکرێت بە گردێك لە فەلسەفە. ئەم شێوازە هاوشێوەیەکی سەیرە بۆ شیکردنەوەی زاری (وینگێنشتاین) لە فەلسەفەی مۆدێرندا. راستی لەوەدایە ئەو شتەی سوقرات فێری دەکرد، زیاتر شێوازێکی فەلسەفییە — واتە بیرۆکەی روون و راشکاو بوو لە بری ئەوەی جۆرێك بێت لە فەلسەفە. ئەم شێوازەی بە تەواوی بە شێوازێك دانەدەنا بۆ بە دەستهێنانی راستیەکان، بەڵکو جیا لەمەش بە چاوی شێوازێك بۆ کردەوەیەکی باش سەیری دەکرد. بە دڵنیاییەوە لە سەر ئەم بنەمایە کە لە سەدەی بیستەمدا وینگنێشتاین بڕوای وابوو کە "فەلسەفە بیرۆکە نیە بەڵکو چالاکییە). روانگەیەکی وا بۆشاییەکی سەرەکی لە دڵی بیرکردنەوەی فەلسەفی دا بەجێدەهێڵێت. وا چاوەڕوان دەکرا کە پاش سوقرات، ئەفلاتون ئەم بۆشاییە پڕ بکاتەوە.

پاش تێپەڕبوونی دەیەیەك، ئەفلاتون بە گەشت کردن گەیشتە (سیسیل) و لەوێ قوپکەی بورکانی شاخی (ئاتێنا)ی بینی. ئەم بورکانە یەکێکە لە سەرنجڕاکێش ترین شوێنە گەشتیارییەکانی ئەم سەردەمەو بە تەواوی دیاردەیەکی جوگرافیایی نەبوو. خەڵك بڕوایان وابوو کە بورکانی (ئاتێنا) شوێنێکە هاوشێوەی جیهانی مردووەکان یان جیهانی

بە شێوازێکی تری فەلسەفی، ئەفلاتون بڕوای وابوو ئەو شتانەی لە ئەزموونی ڕۆژانەمانداو لە چوارچێوەی خۆماندا لێیان تێدەگەین- پێڵاو، کەشتی، یان ئەو مۆمەی کە بۆ مۆر و مۆمکردنی کەلکی لێوەر دەگیردرێت، مرۆڤە بێ سوودەکان‌و پاشاکان بە تەواوی هەمووی دۆخێکی ڕوتینیە. دۆخێکی ڕاستەقینە، جیهانێکی بیرۆکە یان وێناکانە کە ئەم دەرکەوتانە یان ڕواڵەتانە لەوە سەرچاوە وەردەگرێت. لەمڕووەوە دەتوانین باسی ئەوە بکەین ئەسپێکی ڕەشی تایبەت، دەرکەوت‌و خۆی لە بیرۆکە- یان نموونەی گشتیی ئەسپ و نموونەی ڕەشی وەردەگرێت. بە بەردەوامی لە ئاڵۆگۆڕدایە. لە بری ئەوەش چوارچێوەی گشتیُی بیرۆکەکان کە ژێری لێی تێدەگات، نەگۆڕە. هەر بیرۆکە یان نموونەیەك وەك: بیرۆکەی (هێلکەیی بوون، مرۆڤ، ڕەنگ، جوانی‌و هەندێ شتی لەو بابەتە- وەك نموونەو سەرچاوەی شتۆمەکی وردەکاریی جیهانە، بەڵام شتۆمەکی وردەکاری بۆشاییەکی تەواوە. ئێمە دەتوانین بە کەڵك وەرگرتن لە وردەکاریی ژیرانەی وردەو وێناکردنی خود بەرامبەر بەم بیرۆکە گشتیانە بپالێوین‌و چاکی بکەینەوەو وردە وردە باشتر لێیان تێبگەین. لەمڕووەوە دەتوانین بگەین بە ڕاستی یان ڕاستیی بنەڕەتی ڕووناکایی ڕۆژ کە لەوپەڕی ئەشکەوتی تاریکی جیهانی ڕۆژانەماندایە.

چوارچێوەی بیرۆکە گشتیەکان، لە زنجیرەیەك پێکدێت کە لە وێنای بچوکترەوە دەست پێدەکات‌و بە بیرۆکەی والاتر کۆتایی پێدێت کە سەرچاوەی هەموو ئەوانە بیرۆکەیەکی خێرە. کاتێك فێر بین لە

دیاردەی فەلسەفەی ئەفلاتون، بیرۆکەی وێناکانیەتی کە لە سەرانسەری ژیانیدا دەستی بەرنەدا لە پەروەردەکردنی ئەو بیرۆکانەی. ئەمەش بەو واتایە دێت کە بیرۆکەی ئەفلاتون لەگەڵ چەندین شیکردنەوەی جیاوازدا دەگاتە دەستمان، لەمڕووەوە مایە یان هەوینی پێویست بۆ وتووێژ و گفتوگۆ لەبارەی ئەوە لە بەر دەستی فەیلەسۆفانی دوای خۆیی داناوە. ( هیچ بیرۆکەیەکی فەلسەفی ناتوانێ دڵنیا بێت لە مانەوەی خۆی، جیا لەوە کە بۆ گفتوگۆ و وتووێژ لەمبارەیەوە هەبووبێت کە رێگای شیکردنەوەو شیکار چیە).

باشترین دیاردەی بیرۆکەی ئەفلاتون تایبەتمەندە بە خۆی. (ئەم دۆخە لە فەلسەفە دا لە شوێنەکانی تر بە بەردەوامی دانانرێت). بە داخەوە دیاردەی ئەفلاتون لە چوارچێوەی وێنایەکدا دەردەکەوێت کە زیاتر لە چوارچێوەی ئەدەبیاتدا شوێن خۆی دەگرێت تاکو فەلسەفە. بە کورتیەکەی ئەفلاتون شرۆڤە دەکات کە زۆرجار گوایە مرۆڤەکان لە ئەشکەوتێکدا یان (ژێرزەمینێك)ی تاریك بە سەر دەبەن. ئەو دەڵێت ئێمە لەم ئەشکەوتەدا بە زنجیرێکەوە بەستراوینەتەوەو روخسارمان بەرەو دیوارێکی رووتو قووتە. لە پشت سەرمانەوە ئاگرێك داگیرساوە. هەموو ئەو شتانەی ئێمە دەیبینین، هەندێ سێبەری جووڵاوەیە کە لە سەر دیواری ئەشکەوتەکە دەرکەوتوودو ئێمەش ئەم سێبەرانە بە راستەقینە دەزانین. تەنها ئەگەر هەر ئەوەندە فێر بین روخسارمان لە دیوارەکە بگەڕێنینەوەو سێبەرەکان ببینینو لە ئەشکەوتەکە هەڵبین، دەتوانین هیوادار بین کە رووکانایی راستەقینە دببینین.

بۆ نموونە، بیرۆکەی ئەفلاتون لەباردی دروستکردنی جیهان، بە ئاسانی لەگەڵ مێژووی خولقاندا لە روانگەی جوولەکەو مەسیحیەت یەك دەگرێتەوە. بە وتەی ئەفلاتون "باوكو خولقێنەر، خولقێنەرێکی زیندووە کە روخساری خواوەندە نەمرەکانی خولقاند. کاتێك بەم خولقاندنەدا روانی، زۆر دڵخۆش بوو، ئنجا بڕیاریدا تا زیاتر لە رەسەنایەتیی خۆی هاوشێوەی بکات. چونکە بنەمای ئەم خولقاندنە نەمر بوو، هەوڵیدا تا ئەو رادەیە کە دەکرێت کەون بە نەمری بهێڵێتەوە. لەوڕووەوە وێنایەکی جووڵێنەری لە نەمری خولقاند. کاتێك ئاسمانی دروست کرد، ئەم وێنایەی نەمر کرد، بەڵام جووڵێنەرو بە گوێرەی ژمارەکان داینا. ئەمەش شتێکی جیاوازە لەگەڵ نەمریدا کە تاقانەو نەجووڵێنەرە. ئەم وێنا جووڵێنەرە هەر ئەو شتەیە کە ناوی "کات"ی لە سەر دادەنین."

ئەو شتەی لەم بەشە دەستمان دەکەوێت، تا رادەیەك هاوشێوەی دەنگدانەوەیەکی گۆڕێنەرە لە "گەشتی پەیدابوونەوە" واتە تەورات. کە نزیکەی هەشت سەد ساڵی رابردوو نووسراوەو لە واتای فیساغۆرس سەرچاوەی گرتووە. سەرەڕای ئەمەش ئەو بیرۆکەیە کە ئەفلاتون لەمبارەیەوە دەیخاتەڕوو، وێنایەکی جووڵێنەرە لە نەمری. لە سەرووی بیرۆکەیەکی ئاینی قووڵ (زیاتر لە بیرۆکەیەکی لە رادەبەدەر جوانە). ئەم بیرۆکەیە، بیرۆکەیەکی پڕ ناوەڕۆك و گرنگی فەلسەفییە. بیرۆکەکەی ئەفلاتون لەبارەی کات لە دۆخێکدا پەسەند کراو کە ئێمە تیایدا دەژین پەیوەندی دەداتە لوتکەی بیرۆکەکانی جیهانەوە.

جیهـانی روتــینی روخــسارمان بگێڕینــەوە بــۆ جیهــانی راسـتیەکانو سەرنجمان بخەینە سەر راستیەکانی بیرۆکـەی پەیوەست، تێگەیشتنمان ئـەو توانایـە بـە دەست دێنێـت کـە وردە وردە بـە شـێوازی زنجیرەیـی بیرۆکەکان بەرەو لوتکـە بـڕوات تـا بگاتـە لوتکـەی تێگەیـشتنەکان، واتـە تێگەیـشتنی ناسـینی بیرۆکـەکانی جـوانی، راسـتیو لـە کۆتاییـدا بـە بیرۆکەی خێر کۆتایی پێبێت.

ئەم مەسەلەیە بەردو رەوشتی ئەفلاتونمان دەبات. بە سەرنـج خـستنە سەر جیهانی وردەکاریەکان، لە کۆتاییدا ئـەو شـتانەی دەکـرێ ببیـنین، دەسـکەوتێکی رواڵەتییـە. تـەنها بـە یارمـەتیی ژیرییـە کـە دەتـوانین رۆشناییەك سەبارەت بە بیرۆکـەی گـشتیی دەسکەوتەکەمان بـە دەست بێنین کە گرنگییەکی والای هەیە. لێرەدا ئەفلاتون پـەرە بـە رەوشـتێك دەدات لـە سـەر بنـەمای رۆشـبیریی نـاخ، نـەك بنەمایـەکی تایبـەتی هەڵسوکەوت. جیا لـەوەش بیرۆکـەی ئـەفلاتون بـە هـۆی بێهوودەبـوونی کـە جێبـەجێ نەکراوەیـە، رەخنـەی لێـدەگیردرێت. دەڵـێن بـە گـوێرەی قسەکانی خودی ئەفلاتون هەموو ئەو شتانەی وەسفی دەکات، بە گـشتی بیرۆکەیەکی جیهانییە نەك خودی جیهان. هەندێکی تر وا دەنوێنن کـە جیهان بیرۆکـەکانی ئـەفلاتون تـەنها لـە زەینـدایـەو پەیوەندییـەکی زۆر کەمیان هەیە بەو جیهانەی کە ئەم بیرۆکانە لەوێوە بە دەست دێـن. لـە لایـەکی تـردوە سروشـتی والای پێـشکەوتن یـان ئەوپـەڕی سروشـتی فەلسەفی، ئەو شایستەییەی هەبوو کە زۆربەیان بە لای مەسیحییەتەوە پەسەند کران.

کە لە هێز و بەرجەستەییدا هاوتای بیرۆکەی ئەفلاتون بوو. ئەم بیرۆکەیە لە بنەمادا هەمان بیرۆکەی ئەفلاتونە کە دۆخێکی دەروونی یان زەینی لە خۆ گرتووە. پانزە سەدە لە سەردەمی ئاگۆستیەن تێپەڕی، تەنها بیرۆکەی "کانت" بوو کە هاوسەنگی بیرۆکەی ئاگۆستیەنی پیرۆز هاتە ئارا. ئەم بیرۆکەیەش دۆخێکی زەینی هەبوو. کانت لە بنەمادا بڕوای وابوو کە کات بەشێکە لە هەستی تێگەیشتنمان کە لە ڕێگای جیهانەوە لێی تێدەگەین. سیستمی تێگەیشتنمان وەك چاویلکەیەك وایە کە هیچ کات لە چاومان لای نابەین. سەرەڕای هەموو ئەم بارودۆخانە ئەمە بیرۆکەی ئەفلاتونە کە زیاتر لە بیرۆکەکانی تر لەگەڵ نوێترین بیرۆکە زانستیەکانی تر سەبارەت بە کات کێبڕکێ دەکات. کاتێك خوڵقێنەر ئاسمانی ساز دا، ئەم وێنایەی نەمر دروست کرد، بەڵام جووڵێنەر، لە سەر بنەمای ژمارەکان دروستی کرد. بە واتایەکی تر کاتو جیهان پێکەوە دروست کران. ئەم قسەیە لەگەڵ بیرۆکەی "تەقینەوەی گەورە"(Big Bang) سازگارە. بیرۆکەیەك کە دەڵێت ئێمە ناتوانین باسی سەردەمی پێش "تەقینەوەی گەورە" بکەین، چونکە لەو کاتەدا هیچ کاتێك لە ئاردا نەبووە.

زانستو فەلسەفە چەند ڕێگایەکن بۆ ڕوانین بە جیهاندا کە بە گشتی لە یەك جیاوازن: ئەم دوانە بێ قسەو باس لە یەك جیان. وەك چۆن "برناردۆ ماندویڵ" دەڵێت: "کەسێك خۆی بە شتێکەوە خەریك کردووەو کەسێکی تر پرسیار دەکات بۆچی وایە." سەرەڕای ئەمانەش

کات بە بەردەوامی یەکێك بووە لە قەیراناوی ترین واتاکان کە فەیلەسوفەکان لە ئاڵۆگۆڕدان لە گەڵیدا. جیا لەوەش لە ریزی ئەو واتایانەدایە کە کەمترین بەرهەمو سوودی هەیە. هەمووومان کات دەناسین، جیا لەو شتانەی لەبارەیەوە باس دەکەین بە بەردەوامی لە جووڵەدایە. هەمووومان وێنا دەکەین کە کات چییە، بەڵام زۆر دژوارە کە ئەوە لەگەڵ هەندێ رستە یان وتەدا پێوانە بکەین کە هاوئاهەنگ نەبێت بۆ نموونە: کات بریتییە لە ئەستۆگرتن، یان بێ مێشکیو بێ ئیرادەیی، بۆ نموونە: هۆنراوەبێژی ئەمریکی "سارۆ" دەڵێت: "کات تەنها رووبارێکە کە من بۆ راوەماسی دەچمە ناویەوە".

بیرۆکەی ئەفلاتون سەبارەت بە کات، وێنای فەیلەسوفانەو شاعیرانەی پلە یەکەمێك بوو کە نەك هەر بە وردی لەگەڵ بیرۆکەکانیدا سازگار بوو، بەلکو جیا لەوەش لە پلەی سەرەکیی بنەوانەدا کە وردەکاریەکانی ئەم بیرۆکەیە پێکەوە گرێدەدراو دەیکرد بە یەك، لەو کاتەدا دەردەکەوت. ئەم بیرۆکەیە "دینامۆیەکی ورد و گرنگ"ە کە جووڵەکەی هەموو بەشەکان وەك گشتگیرییەك دەهێنایە جووڵە. سەرەڕای ئەمانەش ئەمە وێنایەکی میکانیزمیو وردبینانەیە کە هیچ سوودێکی لە کات وەرنەگرتووە، چونکە جیهان بیرۆکەی سەربەخۆ و گۆڕێنەر نیە، ئنجا لە لایەن کاتەوە ناجووڵێتەوە.

لە سەردەمی ئەفلاتونەوە تا ئێستا رێژەیەکی زۆر دەگمەن هەبوون کە بیرۆکەیەکی رازیکەریان هەبووبێت سەبارەت بە کات. حەوت سەدە لە سەردەمی ئەفلاتون تێپەڕی تا "ئاگۆستیەن" بیرۆکەیەکی هێنایە ئارا

تیایدا بەختەوەری بەمشێوەیە واتا دەکرا کە لە رۆژێکدا دوو جار تێروپڕ خواردن بخواتو هیچ کات لە کاتی شەواندا بە تەنها نەخەوێ." وادیار بوو ئەم شتانەی لە روانگەی ئەفلاتونی تەمەن چل ساڵەوە زۆر گاڵتەئامێزانە بوو. ئەو ئەفلاتونەی کە رەوشتە دژوارە ئەسینابیەکەی زوو بە زوو دیونوسیۆسی تووڕە کرد.

دیونوسیۆس لە سەرەتای تەمەنیەوە لە پیشەی سکرتێری لە ناوەندی ئیدارەی دەوڵەتی دا دەستی بە کار کردبوو، بەڵام هەر لە سەرەتاوە توانا درەوشاوە شێعریەکانی تیایدا بەرجەستەو بەرچاو بوو. پاشان پلەی سەربازیی دوا بە دوای یەك بڕیبوو، لە هەمان کاتدا چەند تراژیدیای رێکخستبوو کە ئەو شێعرانە مۆستایان هەبوو کە بەهایەکی بێ هاوتایان هەبوو، بۆ پشت راستکردنەوەی ئەم مەسەلەیە، هەموو ئەو نەفسەرانەی لە ژێر دەستیدا کاریان دەکرد، جەختیان لە سەر ئەم مەسەلەیە کردەوە. دیونوسیۆس پاش گەیشتنی بە دەسەلات دەستی کرد بە هەندێ داگیرکاریی وەحشیانە، سیراکۆسی کردە بەهێزترین شاری یۆنانی لە رۆژئاوای یۆناندا. ئەسینابیەکان بۆ ئاسانکردنی رێگای پەیوەندیی دیپلۆماتیك، دیونوسیۆسیان دڵنیا کردەوە کە سیناریۆکەی کە ناوی "فەدییەی هکتۆر" بوو لە میهرەجانی "لنا"دا خەلاتێك وەربگرێت.

دیونوسیۆس لەو کەسانە نەبوو کە خۆی وا لێبکات فەرمان لە کەسێکی دەسەلاتداری فەیلەسوف وەردەگرێت کە هەوڵدەدات داوای لێبکاتو سواڵی لێبکات بۆ پلەو پایەیەك. کاتێك ئەو و ئەفلاتون سەرقاڵی

کاتێـك زانــستو فەلــسەفە پێکــەوە ئاشــت دەبنــەوە، دیاردەیــەکی دڵنیاکەرەوەیە. کاتێك فەلسەفە تایبەت بە سەردەمێك لـە زانـست بێت کـە تیایـدا بـەهێزترین شـێوەی وزەی جووڵـەدار واتـە هێـزی کـاری کۆیلەکان بـوو، تـەنها کارێـك کـە دەکرێ جێبـەجێ بکرێـت ئەوەیـە لـە سەرسوڕماندا پەنجەی خۆمان بگەزین.

ئــەفلاتون کاتێــك لــە سیــسیل دەژیــا، لەگــەڵ "دیــۆن" ژن بــرای "دیونوسـیۆس" فـەرمانڕەوای "سـیراکۆس" هاوڕێیەتیـەکی باشـی سـاز کرد. (دیۆن) هاوڕێیەکەی خۆی بۆ لای (دیونوسیۆس) برد، رەنگـە بـەو هیوایـە کـە پیـشەو پلـەو پایەیـەکی لـە دەربـاردا بـۆ دابـین بکـات وەك فەیلەسـۆفی دەربـار، بـەڵام ئـەفلاتون سـەرەڕای ئەشـتەکانی بـە سـووچو گۆشەی جیهاندا تا رادەیەکی زۆر باش وەك ئەسـینایيەکی دەوڵەمەنـدو خانـدان مـابووەوە، دۆخـی بەرچاوتەسـکی سـەبارەت بـە سیراکۆسـی بـە بـاش نـەزانی. دیونوسـیۆس پلەوپایـەی سوپاسـالاری‌و فـەرمانڕەوایی زاڵمانەی هەبوو، لە لایەکی تر خۆی بە گەورەترین رۆشنبیر دادەنـا کـە لە سەرووی هەموانەوەیە. لە رۆژێکدا دوو ژنی بە هاوسـەرگیری دەسـت نیـشان کـردو هێنـای کـە ناویـان "دووریـس"و "ئاریـستۆماخ" بـوو، لـە شەوی بووکێنیدا هەر دوو هاوسەرەکەی لە شوێن خەوەکەی دانابوو.

کاتێك ئەفلاتون چووە ئـەو بارودۆخـەوە وادیـار بـوو کـە کەش‌وهـەوای دەربـار هێـور بووەتـەوە. بـە گـوێرەی وەسـفەکانی بارودۆخەکـە باشـتر هەستی پێدەکرێت، تەنانەت ئەگەر بڵێت "لە سـەلیقەی چێـشت لێنـانی ئیتاڵیاییدا هیچ شتێکم نەدۆزیـەوە کـە رازیـم بکـات، ئـەو شـوێنەی کـە

ڕۆڵی دیونوسیۆس بەوجۆرەی کە ڕێکخرابوو جێبەجێ کرا. ئەفلاتون تووشی ترسێکی فەیراناوی بوو. وێناکردنی ئەم دۆخە کە ناچار بێت بۆ بوونەوەرێکی زیندوو کار بکەیت، چونکە دڵی هەر فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە دەلەرزێنێت. ئەوەندەی نەخایاند کە هاوڕێیەکی کۆنی ئەفلاتون کە دەوڵەمەند بوو بە ناوی (ئانیکریس کورنایی) لە بازاڕی کۆیلەفرۆشەکانی ئەگینا ناسیەوەو بە نرخێکی هەرزان کڕی کە نرخەکەی بیست (مینە) **Mine** بوو. ئانیکریس ئەوەندە بە هۆی ئەو کۆیلەیەی کە کڕیبوو دڵخۆش بووەوە کە لەگەڵ پارەکەشیدا ئەوی ناردەوە بۆ ئەسینا تا خوێندنگەیەك ساز بکات.

ئەفلاتون لە ساڵی (٣٨٦) پێش زایین پارچە زەوییەکی لە باخی (ئەکادیمە)دا کڕی. ئەم شوێنە کە لە ١ کیلۆمەتری باکووری ڕۆژئاوای ئەسینایە، لەوپەڕی دەروازەی (ئەریا)ی لە نێوان دیوارەکانی شاری کۆندا بوو. باخی ئەکادیمە شوێنێکی سەوزەڵانی بوو کە بەش بەشی ئەو شوێنە دارەکان زۆر بەرزو جوان ڕاوەستابوون‌و لە سێبەریاندا ڕێژەیك پەیکەرو پەرەستشگە دالّدەیان گرتبوو. لێرەدا لە نێو ڕاڕەوە فێنکەکانی ئەو باخ‌و رووبارانەدا، ئەفلاتون ئەکادیمەکەی بنیات نا و گروپێك لاینگرو بیرمەند دەوریان پڕ کردەوە، کە چاوەڕوان نەدەکرا ژنیان لەگەڵ بێت، لە نێویانیاندا چەند ژن دەبینرا، یەك لەو ژنانە (ئەکسیۆیتا) بوو کە وەك پیاوەکان جل‌و بەرگی لەبەر دەکرد. ئەکادیمەکەی ئەفلاتون بە یەکەم زانکۆ ناو دەبرێت‌و دەناسرێت.

باسێکی فەلسەفی بوون، خێرا یەکەم پریشکەکان ئاشکرا بوون. ئەفلاتون لە شوێنێکدا تیگەیشت دەبێ رەخنە لە هەڵەیەکی دیونوسیۆس بگرێت.

دیونوسیۆس بە رقو توورەییەوە هاواری کرد: " وەك پیرێکی نەزان قسە دەکەیت."

ئەوسا دیونوسیۆس بریاریدا بە گوێرەی بیرۆکەی فەیلەسوفێك هەڵسوکەوت بکاتو فەرمانی دا لە زنجیری بکەن. ئەفلاتونیان خستە ناو کەشتیەکی ئەسپارتی کە بەرەو "ئەگینا" دەرۆیشت: ئەو شوێنەی کە فەرمانیان بە کاپتەین کردبوو لەوێ ئەفلاتون وەك کۆیلەیەك بفرۆشێت. دیونوسیۆس بە کاپتەینی وت: "دڵەخۆر مەبە، ئەو ئەوەندە فەیلەسۆفە کە تەنانەت تێناگات."

هەندێ لە سەرچاوەکان وادەڵێن کە لەو کاتەدا ژیانی ئەفلاتون مەترسی هاتۆتە بەر، بەڵام ئەم راستیە کە بەرەو ئەگینا نێردراوە، هێمای شتێکی ترەو پیشاندەری ئەوەیە رەنگە ئەم دوورگەیە شوێنی لە دایك بوونی ئەفلاتون بووە نەك ئەسینا. ناردنەوەی ئەفلاتون بۆ زێدی خۆی بە شێوەی کۆیلەیەك سووکایەتی پێکردن بوو لە لایەن دیونوسیۆس کە چێژی پێدەبەخشی. جیا لەوەش دیونوسیۆس دەیتوانی تا رادەیەك دڵنیا بێت رەنگە هاورێیەکی ناوداری ئەفلاتون بیناسێتەوەو بیکرێتەوە، لەوروەوە خۆی ببێتە بەربەست لە بەردەم ئەنجامی خراپی دیپلۆماتیکی ئەم مەسەلەیە لە پەیوەندییان لە گەڵ ئەسینادایە.

هەمیشە لەناو چووە. سەیر لەوەدایە کە هێشتا خانووەکەی هکادمۆس هێشتا لە شوێنی خۆیدا ماوەتەوە. لە ژێر تاقێکی هاوشێوە بنمیچ کە لە زیو و مس- کە ئاسەوارناسەکان بۆ پاراستنی ئەو شوێنە دروستیان کردووە، دەتوانین زۆر شت ببینین وەك: بەردی بیناکە کە لە قوڕو کا دروست کراوە(کاگڵ)، پاشماوەی دیوارەکانی کە لە خشتی گڵ دروست کراوە، ئەو پاشماوانەی کە لە کاتی دروستکرنی ئەکادیمادا بە دەستی ئەفلاتون دروست کراون. زیاتر لە دوو هەزار ساڵە بە سەریا تێپەڕ دەبێت. وادایار بووە کە دیونوسیۆس توانایيەکی نەمرتری هەبووە.

لەم نێوانەدا رێك لەوبەری ئەو زەوییەی کە ئەکادیمی لێ دروست کرا، ئوردۆگایەکی نوێ بینا کرا کە تیایدا دۆخێکی هاوشێوە لەگەڵ بارودۆخ و کەش‌وهەوای ئەو خانووەی کە پێش مێژووی هکادمۆس لە ئارادا هەبوو، هێشتا پاش تێپەڕبوونی چوار هەزار ساڵ ماوەتەوە. خێزانە ئاوارەو کۆچکردووەکان لەوێ نیشتەجێن، منداڵانی شیرەخۆرە کە مێش بە سەر دەم‌وچاویانەوە نیشتووەو دایکەکانیان شیریان پێدەدەن، منداڵەکانیان سەریان تاشراوە، ژوورەکانیان بە مقەبا دروست کراوەو لەو مەلەوانگانە کە ئاوەکانیان بەردەوام ماوەتەوەو ناگۆڕدرێت خۆیان دەشۆن لە ژێر هەتاوی گەردار. کۆمەڵێك مێش بە سەر دەم‌وچاویانەوە رەش دەکاتەوەو دەموچاوی ئەو منداڵانەو ئەو ئاوارانە باشترین شوێنە بۆ یاریکردن‌و سەرقاڵیی مێشەکان، لە هەمان کاتدا دایکەکانیان کە لەچکیان بە سەرەوەیە لە نێو خۆڵ‌و پاشماوەکاندا دانیشتوون‌و شیر دەدەنە کۆرپە بەر مەمکەکانیان.

باخەكەی ئەكادیمەی ئەفلاتون كە لەوێ ئەكادیمە بنیات نرا (كە ئەو پەیمانگایە ناوی خۆی لەودوە وەرگرتووە)، دوای بە دوای نیشتەجێبوونی پێشۆی ئەو شوێنە ئەو ناوەی لە سەر دانرا. ئەم كەسە ناوی (هكادمۆس) بوو، قارەمانێكی نیوەخواوەندی ونبوو لە ئەفسانەكانی (ئاتیك)یدا. دەسكەوتی گرنگی هكادمۆس ئەمە بوو كە لێرەدا دوانزە داری زەیتونی ناشت كە یەكەم لقوپۆی داری زەیتونی پیرۆزی ئەسینا بوو لە ئاكروپۆلیس دا. سەرەڕای ئەمانەش كاتێك ئەفلاتون ئەم شوێنەی هەڵبژارد ئەنجامەكەی وابوو كە تەناتەت یادی هكادمۆسی بە دۆخێكی شارستانیەت لە جیهاندا ناوی لێ ببرێت، كەواتە لێكدانەوەمان لەو ناوە ببێتە جوانیی هەموو شت، لە كۆلێجی سكرتێری بگرە هەتا سینەما، یەكێك لە تیپەكانی تۆپی پێ ی سكۆتلەندو خەڵاتی سالانە بۆ كەسایەتییە نیوەخواوەندی هاوشێوە كە دەسكەوتی نەناسراویان هەبووە.

ئەمرۆكە باخی ئەكادیمە پارچە زەوییەكی پەنا و دوورەو وێرانەیە كە لە باكووری رۆژئاوای ئەسینادا خەوتووە، ئەو شوێنەی كە ناوچەكانی ناو شار بە شێوەیەكی هەماهەنگو نایەكسان لە قەراخی شاردا وردە وردە پەرە دەستێنێت. ژێر دارەكان لە لای وێستگەی پاسەكان، بەردە لێكداوەشاوەكانی سەردەمی دێرین، تۆپەڵەیەك لە خۆڵو پاشماوەی ماڵەكان لەو ناوەدا كە جارناجار لەوێ دەیرێژنو چەند كورسییەك كە هۆنراوەو بیردوەرییان لە سەر نووسراوە. شوێنی ئەكادیمەكەی ئەفلاتونو ئەو خانوودەی كە تیایدا دەژیا بە ئەگەرێكی زۆر بۆ

دەروونناسەکان، پەروەردەو فێرکاری، خاوەنداریێتی گشتیو تایبەتو زۆربەی مەسەلەکانی تر دەدرکێنێت، ئەم مەسەلانە لەوشێوە بابەتانەیە کە تەنانەت ناتوانرێت لە میوانیەکی نانی شێودا خۆتی لێ دوور بگریت، بەلاّم خێرا تێدەگەین کە کۆماری نەبوو بە میوانیەکی شێوی دلّنیشن. ئەو کۆمەلگەیەش کە کۆماری پێشنیاری دەکرد ئەوەندەش گرِوتینی نەبووە. تا رادەیەك بیرورِای ئەفلاتون سەبارەت بە مەسەلە نە بیرکراوەکان بە توندی بەپێچەوانەی ئەو بیرورِایەیە کە لەم رۆژانەدا هەمووان بروایان پێیەتی جگە لەو کەسانەی کە زۆر دەمارگیرنو هەندێ بیریان مەیلەو ناهاوسەنگییە.

لە کۆمارییەتی ئامانجگەرای ئەفلاتون نە باسی دارایی دەکرێتو نەش هاوسەرگیری، رەنگە لە نێو چینی خوارەوەی کۆمەلگەدا هەبێت کە ئەوەش رەنگە تەنها ئەو خەلّکە بن کە ئەم شتانەیان بەلاوە شایانە. مندالاّن لەگەلّ لەدایك بوونیان لە باوەشی دایکەکانیان جیا دەکرێنەوەو بە شێوەی هاوبەش پەروەردەو بەخێو دەکرێن. لەمرِووەوە ئەوانە دەگەنە ئەو ئاستە کە ولاّت (= کۆمەلگە/ دەولّەت/ حکومەت) بە باوكو دایکی خۆیان بزاننو بە درێژایی ژیانیان خەلّك بە براو خوشکی خۆیان بزانن. تا تەمەنی ٢٠ سالّی فێری وەرزشو مۆسیقای وروژێنەریان دەکەن، هیچ جۆرە مۆسیقایەکی ئەیۆنیایی یان لیدیایی ئیجازەی پێنادرێتو تەنها سروودی سەربازی بۆ دلگەرم کردنیانو خۆشەویستیان بەرامبەر بە ولاّت ئیجازە پێدراوە.

"یەکسانی چییە؟" ئەفلاتون ئەم پرسیارە لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا بە ناوی "کۆماری" دەخاتەڕوو. لەم وتوویژەدا سوقراتو کۆمەڵێك کە بۆ خواردنی نانی شێو لە ماڵی دەوڵەمەندانەی کەسێکدا کۆ دەبنەوە. کاتێك سوقرات دەست بە قسەکردن دەکات، ئامادەبووان لە کۆڕەکەدا لە سەر ئەم خاڵە ڕێك دەکەون کە هەوڵدان بۆ وەسفی یەکسانی هیچ بەهرەیەکی نیە جیا لەوە لە شوێنێك یان دۆخێکی ناوەڵاتر واتە لە کۆمەڵگەدا وەسفی بکەین. سوقرات دەست بە کار دەبێت تا رای خۆی سەبارەت بە کۆمەڵگەیەك کە یەکسانیی تیایە شرۆڤە بکات.

بە گشتی وتوویژی سەرتایی کە بە قەڵەمی ئەفلاتون نووسراوە کە سوقرات ئەستێرەی ناو ئەوانەیە، ناوەڕۆکی ئەندێشەکانی سوقراتە. ئەم ئەندێشانە کە لە وتوویژی سەردەمی ناوەڕاستو سەردەمی کۆتایی گۆڕینی بە سەردا هاتووەو ئەو ئەندێشانەی کە سوقرات لەم بەرهەمانەدا دەیخاتەڕوو، تایبەت بە ئەفلاتون دەژمێردرێت. "کۆماری" بە باشترین وتوویژ ناودەبرێت لە سەردەمی ناوەڕاستدا هەروەها ئەفلاتون لەم بەرهەمەدا لە کاتی خستنەڕووی شرۆڤەکانیو ڕێنوێنیەکانیداو دانانی ڕێسایەك بۆ کۆمەڵگەیەکی یەکسانیخواز، ئەندێشەکانی خۆی سەبارەت بە مەسەلە ئاوەڵاکان پەرە پێدەداتو شیدەکاتەوە وەك: ئازادیی رادەربڕین، فیمینیزم، زاڵ بوون بە سەر داینامۆکاندا، رەوشتو پەروەردە کردنی گشتیو تاکەکەسی، ئەو شتانەی کە پەیوەستە بە باوكو دایکانەوە (**parenthood**)،

ژیانی خەڵکی جیهان کاری حکومیو بەڕێوەبردنی وڵات بە شێوەیەکی پراکتیکی هەڵدەسەنگێنن. ئەمانە لە تەمەنی پەنجاساڵیدا شایستەی فەرمانڕەوایی دەبن.

ئەم فەیلەسوفە فەرمانڕەوایانە لە شوێنێکی نیشتەجێبوونی بەکۆمەڵ و هاوبەش ژیان بە سەر دەبەنو لەوێ هیچ جۆرە داراییو سامانێکی تایبەت بە خۆیانیان نیەو ناتوانن بەوجۆرەی کە حەزیان لێیە نزیکی و کاری سێکسییان هەبووبێت. لە نێوان پیاوانو ژناندا یەکسانیەکی تەواو دابین کراوە (هەرچەند ئەفلاتون لە وتووێژێکی تردا بە شێوەیەکی دوور لە ,چاوەڕوانی دەڵێت: " ئەگەر ورە لە ماوەی دیاریکراوی خۆیدا لە ناخی پیاوێکدا نەتوانێت بە باشی بژیت، دەڕواتە ناخی ژنێکەوە." ئەم هەڵگەوتوانە بەمشێوەیە بە شێوەی ژیانی هاوبەشو نەبوونی هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی تاکەکەسی، تووشی بەرتیل وەرگرتن نابێتو تەنها ئامانجیان: دابیکردنی یەکسانی لە کۆمەڵگەیە. بەڕێوبەری حکومەت واتە ئەو فەیلەسوفە فەرمانڕەوایە لە نێوان ئەم ڕێژە کەمەدا هەڵدەبژێردرێت.

سیستمێکی وا تەنانەت بۆ حاکمیەتی شارەکانی ئامانجگەرای بچوك (کە ماوەیان لە دەریاوە ٩ کیلۆمەترە)، کە ئەم سیستمەیان بۆ یەکجاری لە بەرچاو دەگیردرێت. پەیڕەونامەیەکی قەیراناوی دەردەکەوێت. لە باشترین دۆخدا ئەم حاکمیەتە لە شاردا بە شێوەیەکی سەیر بێتاقەتکەرە، چونکە هەموو هۆنراوەبێژانو سیناریۆنووسەکانو ئەوانەی کە بە شێوەیەکی خراپ مۆسیقا دەژەنن، هەروەها پارێزەری

هەموو ئـەم شتانە مـرۆڤ هانـدەدات بـیر لـە منـداڵیی خـودی ئـەفلاتون بکاتــەوە. بـۆ جــەخت کردنــەوە لــە ســەر ئــەم قــسەیە (دیــوگنیس لایەرتیۆس) ئاگادارمان دەکاتەوە کە باوکی ئەفلاتون "خۆشەویستیەکی بەتین"ی بۆ دایکی ئـەفلاتون هـەبوو، بـەڵام نـەیتوانی ئـەوە بکاتـە هـی خـۆی. هەرچـەند ئـەفلاتون بـە ئەگـەرێکی زۆر منـداڵی راستەقینەی بـاوك‌و دایکـی خـۆی بـوو، بـەڵام وادیـارە کـە دایکـی مێردێکـی تـری هەڵبـژاردبێت، ئـەفلاتون تـا رادەیـەك لـە نێـو چـەند کۆمەڵگەیەکـدا پەروەردە کراو بەخێو بوو. لەمڕووەوە رەنگە سەیر نەبێت کە ئەفلاتون لە خۆیدا ئەوەندە ئارەزووی بۆ ژیانی خێزانی نەبوو.

لـە بیرۆکـەی ئـەفلاتون دا ئـەو کەسانەی کـە سوودیان لـە پـەروەردەی جەستەیی‌و مۆسـیقایی خۆیـان وەرگرتـووەو تـا رادەیـەك تێگەیـشتنیان بەر کەوتووە، لە تەمەنی بیـست ساڵیدا هەڵبـژاردە کـراون‌و لـەوانی تـر جیا کراونەتەوە. ئەم رێژەیەیان بۆ جێبـەجێ کردنـی کـاری جەسـتەیی وەك دابینکردنی ژیانی خەڵك لە رێگای کشتوکاڵی‌و کـاری بـازاڕ روانـە دەکــران. لــەم نێوانــەدا خوێنــدکارە ســەرکەوتووەکان بــە درێــژایی پــەروەردەیان لــە مــاوەی دە ســاڵدا ســەرقاڵی بیرکــاری‌و ژمێریــاری‌و ئەستێرەناسی دەبـن. گروپێکـی تـر لـە سەرنەکەوتووەکان کـە بیرکـاری مێکشی بردوون‌و ناتوانن ئەنجامی بدەن، بـەرەو کـاری پاسـەوانی روانـە دەکرێن. ئێـستا تـەنها نوخبـەکان دەمێننـەوە. ئەوانـە بـۆ مـاوەی پێـنج ساڵ واتە تا تەمەنی سی‌و پێـنج سـاڵی دەرفـەت دەدۆزنـەوە کـە بتـوانن فێری فەلسەفە ببن. ئەوسا لە ماوەی پـانزدە سـاڵدا بـە وردبوونـەوە لـە

دیمۆکراسی کاریگەری هەبووەو نەش دیکتاتۆری. ئەوسا شاری ئەسینا بە هۆی زیادکردنی داماوی پێویستی بە حکومەتێك بوو تا بتوانێت رێکخستن‌و رێك‌وپێکی دابین بکات. لە راستیدا هەندێ لە لێکدەرەوان رایان وایە کاتێك ئەفلاتون باس لە یەکسانی دەکات، زۆرجار مەبەستی ئەوەیە کە زیاتر لە واتای رێکخستن نزیکترە. بە رای ئەفلاتون وادیارە کە رێگەچارەی ئەم مەسەلەیە لە کۆمەلگەیەکی زۆر داخراو و کونترۆڵ کراودا دەدۆزرێتەوە وەك: ئەو کۆمەلگەیەی کە لە ئەسپارت دا دروست کرا، بەلام ئەسپارت بەپێچەوانەی ئەسینا کۆمەلگەیەکی بێ شارستانیەت بوو کە لە بواری ئابوریدا دواکەتبوو، کۆمەلگەیەك کە بۆ مانەوەی خۆی ناچار بوو چینێك خەلکی بێ مێشك‌و شەقاوە دروست بکات کە بە خۆشحالّییەوە فەرمان بەرن‌و تا ئەو ساتەی گیانیان تێدایە کار بکەن. ئەرکی ئەم چینە وابوو کە لە نێوان چینەکانی خواری کۆمەلگەی شارەکان کە رۆژ بە دوای رۆژ فەرمانیان وەرنەدەگرت، دۆخی تۆقین‌و ترس‌و وەحشەت زاڵ بکەن‌و سام بە سەر دراوسێیە پێشکەوتووەکانی ئەسپارت دا بکەن کە لە بواری ئابوری بەهێز بوون‌و ئەمانە هانبدەن فەرمانەکان جێبەجێ بکەن. ئەفلاتون یان لەم مەسەلەیە ئاگادار نەبوو یان پێخۆش نەبوو لە بەرچاوی بگرێت.

ئەفلاتون بە گشتاندن کردنی بڕوای رەوشتی سادەدلانەی سوقرات کە دەیوت: "کەسە باشەکان، بەختەوەرن"_ بڕوای وابوو کە "تەنها کەسە زاڵمەکان چارەڕەشن"، کۆمەلگەیەکی یەکسان لە سەر بنەمای زۆر دابین دروست بکە تا هەموو مرۆڤەکان باش بن، بەلام ئەفلاتون چی

بەرگریکەرو ماڤناسەکان لەوێ ئامادە نین. لە خراپترین دۆخدا بیرۆکەی بەڕێوبردنی شارەکان لە روانگەی ئەفلاتون، کابۆسی تەنها خۆ بینینە کە بە خێرایی هەموو شێوازە ناخۆشە ئاساییەکان کە بۆ پاراستنی وەها رژێمێکی ناپەسەند لە لایەن خەڵکەوە پێویستە، لە داوێنی خۆیدا پەروەردەی دەکات.

بە هۆی دۆخی باشی گەڕانەوە بۆ دواوە هەروا بیرکردنەوە لە رابردوو، بە ئاسانی دەتوانین لە هەڵەکانی ئەم خەیاڵە بێ ئەنجامانە تێبگەین. تەنانەت لێکدانەوەی خودی ئەفلاتون دەیخاتە ریزی هەندێ ناکۆکییەوە. لە بیرۆکەی بەڕێوەبردنی ئەفلاتوندا هۆنراوەبێژەکان گەمارۆ دراون، سەرەڕای ئەمانەش خودی ئەفلاتون لە چوارچێوەی هەڵسەنگاندنەکانیدا لە زۆر وێنای شاعیرانە کەڵك وەردەگرێت. هەروەها ستایشی خواوەندەکان، ئاین‌و ئەفسانەکان قەدەغە کراوە، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش خودی ئەفلاتون چەندین ئەفسانەی لەم بەرهەمەدا (کۆماری) دەگونجێنێت‌و "فەیلەسوفە فەرمانڕەواکان" هاوشێوەییەکی سەیریان بەرامبەر بە (کاست) =(چینی چەقبەستووی کۆمەڵگە) هەیە. خودی ئەفلاتون، خواوەندێکی ئامانجگەرا دروست دەکات، خواوەندێکی دەمارگیر کە دەبێ پەیڕەوی لێبکرێت (گوایە بوونی ئەو خواوەندە شیاوی سەلماندن نیە).

راستی لەوەدایە کە وێنای ئەفلاتون بۆ کۆماری ئامانجگەرا، وادیارە دەسکەوتی بەرهەمی سەردەمی خۆیەتی. ماوەیەك لەوەوپێش ئاسینا لە شەڕی (پولوپۆنزی)دا بەرامبەر بە ئەسپارت شکستی هێنابوو. نە

بە بۆنەی دیۆن-ەوە دەرفەتێکی باش بۆ ئەفلاتون ڕەخسابوو. ئێستا فەرمانڕەوای نورماڵو شیاو بۆ ئەفلاتون بوونی هەبوو تا ئەفلاتون ڕێوڕەسمی فەیلەسوفێکی فەرمانڕەوای فێر بکات. زەینی لە بیرکردنەوەیەکی تر پڕ نەبوو، ئەفلاتون دەیتوانی کۆمارییەکەی خۆی جێبەجێ بکات کە لە بەرچاوی گرتبوو.

ئەفلاتون بە هۆکارێکی تر ئەم (دیمەنە چاوەڕوان کراو =Prospect)ەی بە باش دانەنا. ڕەنگە نیگەرانی بارودۆخی تەمەنی پیری خۆی بوو کە تەمەنی (٦١) ساڵە بوو لە کۆماری ئامانجگەرادا نیشتەجێ بوو. ئایا دەبوایە بۆ پەیوەستبوونی بۆ ریزی نوخبەکان دەست بداتە ڕێکخستنی درێژخایەنی وەرزشو مۆسیقای سەربازی؟ سەرەڕای ئەمەش لە کۆتاییدا "ترسم لەوەیە ورەی دەروونی خۆم لە دەست بدەمو لە چاوی خۆمدا ببمە کەسێك کە بە تەنهایی قسە دەکاتو هەرگیز قسەکانی خۆی جێبەجێ ناکات" ببێتە هۆی ئەوەی لە بەرامبەر تکا و پاڕانەوەی هاوڕێکەیدا سەر دانەوێنێتو گەشتێکی درێژخایەن بکات بەرەو سیسیل.

کاتێك ئەفلاتون گەیشتە سیسیل، سەیری دیونوسیۆسی دووهەمی کرد کە پلانو فێڵێکی زۆری لە مێشکدایە. ڕێژەیەك لە کەسانی ناو دەربار کە دەستیان دەچوو، ئەم کەسە پیرە کە جلی کەشخەی لەبەر دەکردو کەسێکی بیرمەند بوو- لە یادیاندا مابوو، هەندێکی تر لەوانە وادیار بوو دەیانویست ئازار بگەیەننە "دیۆن". لە ماوەی چەند مانگ دا ئەمانە کە دوژمنی فەلسەفە بوون، دەستیان بە کار کردو پاشان

له مێشکدا بوو؟ هەر ئەو پلانە کە ئێوە لە بیرمەندێك دەیبیستن کە لە ئەکادیمەی ئەفلاتون پەروەردە بووەو بڕوای بە بنەماو سووربوون لەسەر هەیە. ئێوەش چاوەڕوانیی دەکەن. ئەم پلانە هەرگیز جێبەجێ نەبوو.

سەرەڕای هەموو ئەمانە سەیر نیە کە پلانێکی وا یان شتێك لەو شێوەیە جێبەجێ کرا. بۆ ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵ کۆمەڵگەی سەدەکانی ناوەڕاست لەگەڵ چینی خوارەوە، چینی (کاست)ەکانی سوپا، قەشە بەهێزەکانیان، هاوشێوەی کۆماریی ئەفلاتون بوو. لە سەردەمی نوێدا کومۆنیزمو فاشیزم زۆربەی تایبەتمەندییە بنەڕەتیەکانی ئەفلاتونیان وەرگرتووە.

بۆ ماوەی چەندین ساڵ ئەفلاتون لە ئەکادیمەدا درێژەی بە کارەکانی دا، تا رادەیەك کە ئەکادیمەی لە ریزی باشترین خوێندنگەکانی ئەسینا تۆمار کرد. ئەوسا واتە ساڵی ٣٦٧ی پێش زاین لە هاوڕێیەکەی خۆی واتە (دیۆن) بیستی کە دیونوسیۆس فەرمانڕەوای زاڵمی سیراکۆس گیانی لە دەستداو کوڕەکەی واتە دیونوسیۆسی دووەم بووە جێگری.

باوکی دیونوسیۆسی دووەم، بۆ ماوەی چەندین ساڵ کوڕەکەی خۆی لە بەند کردبوو تا رێگری لەو خەیاڵانەی بکات کە ئەگەری هەبوو بیر لەوە بکاتەوە ببێتە جێگری پێش ئەوەی خۆی بیەوێت لە شوێنی خۆی دایبنێت. دیونوسیۆسی دووەم لە کۆشکی پاشایەتیدا بەند کرابوو، بە زەحمەت لەتە تەختەکانی دەبڕیو بەوانە مێزو چوارپایەی دروست دەکردو بەمشێوەیە رۆژەکانی تێپەڕ کردبوو.

ئنجا بە تکاو پاڕانەوە بەردەوام ئەفلاتونی بێزار دەکرد. بە ناخێکی شڵەژاوە بە هەموو ئەو کەسانە گوێیان لە قسەکانی بوو رایگەیاند کە ئیتر بە بێ یارمەتیی مامۆستاکەی لە فەلسەفەدا ژیانی هیچ بەهایەکی نیە. دەرەنجام دیونۆسیۆس خێراترین کەشتیی شەڕی بەرەو ئەسینا ناردو هەڕەشەی کرد ئەگەر ئەفلاتون نەیەت بۆ بینینی، هەموو داراییەکانی دیۆن لە سیراکۆس داگیر دەکات.

بە هەر حاڵ ئەفلاتونی تەمەن (٧١) ساڵ سەرەڕای ئەوەی هەستی دەکرد ئەم کارە لە ژیری بە دوورە، سواری کەشتییەکە بوو تا بەرەو سیراکۆس بڕوات. وادیار بوو ئەو کەسەی ئەوی رازی کرد بۆ ئەو گەشتە بڕوات، دیۆن بوو کە لەم بارودۆخەدا سەرقاڵی مەسەلەو ئارەزووی تر بووە لە بری ئەوەی ناخی لە بری بنیاتنانی ئەگەری دەوڵەتێکی ئامانجگەرای ئەفلاتونو "ئەندێشەی سەلماندنی رۆحو ئارەزووەکانی تر بوو.

ئەوەندەی نەخایاند ئەفلاتون بۆ جارێکی تر لە سیراکۆس دا بەند کرا، بووە بەندکراوێك کە لە دوو جار لە رۆژێکدا دەبوایە خۆراکی ئیتاڵیایی بخواردبا، دوورەپەرێزی دەکردو بە تووڕەییەوە هەموو شەوێك قالۆنجەو شتی لەو شێوەیە لە ناو جێیەکەی خۆی دوور دەخستەوە، بەڵام بەختەوەرانە جارێکی تر رزگاری بوو، ئەمجارەیان بە یارمەتیی کەسێك کە لە سەر بڕوای فیساغۆرسی بوو – خۆی بە هاوڕێیو هاوبیری دەزانیو خەڵکی (تارانتۆ) بوو، هاتو لە تاریکترین کاتەکانی شەودا بە کەشتیەکەی خۆی ئەفلاتونی بردو رۆیشت.

ئەفلاتون‌و دیۆن- یان بە خیانەت تاوانبار کرد (داوێکی هەمیشەییان بۆ دانان کە گەلالەی دابینکردنی دەوڵەتێکی ئامانجگەرایان لە مێشکدا بوو)، سەرەتا فەرمانڕەوای دارتاش نەیدەزانی چی بکات. پاش ماوەیەك کە لە هێزی دیۆن تۆقیبوو، خالۆی خۆی خستە تاراوگە، سەرەڕای ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە ئەفلاتون نەتوانێ دەربار بەجێ بهێڵێت. بە فەیلوسوفە پیرەکەی ڕاگەیاند کە پێی خۆش نیە کاتێك ئەفلاتون بگەڕێتەوە بۆ ئەسینا، بە خراپە باسی بکات.

بە هۆی بەختی باش، هاوڕێیان هەلێکیان بۆ ئەفلاتون ڕەخساند تا بەرەو ئەسینا بەڕێبکەوێت، واتە هەر ئەو شوێنە کە خوێندکارە بەوەفەکانی‌و دیۆن لە ئەکادیمەدا چاوەڕێیان دەکرد.

بەلام دیونوسیۆس- ی دووەم بە هۆی هەلاتنی ئەفلاتون ڕەنجا. چونکە بە هۆی وتووێژ لەگەڵ ئەفلاتون زۆر چێژی وەرگرتبوو، هەرچەند نەیدەویست هیچ کام لە بیرۆکەکانی جێبەجێ بکات. (سیراکۆس بە هیچ شێوەیەك لە بارودۆخێکدا نەبوو کە تاقیکردنەوەیەکی وا لە سەر خۆی تاقی بکاتەوە. لەو کاتەدا سیراکۆس تاقانە دەوڵەتی بەهێز بوو کە توانی خۆڕاگری بکات لە بەردەم هێرشی (کارتاژ) بۆ ئیتالیا، هەر ئەو شوێنەی کە لەوێ کارتاژ- کۆماری یەکەمی ڕۆمای نوقمەسار کرد.

وادیارە کە دیونوسیۆس وردە وردە ئەفلاتونی بە کەسێکی پیر یان باوکێکی مەعنەوی دەبینی. گومانی تێدا نیە کە زۆر ئێرەیی بە خالۆی خۆی دەبرد واتە دیۆن کە زۆر بەینی لەگەڵ ئەفلاتوندا خۆش بووە. دیونۆسیۆسی دووەم داوای لە ئەفلاتون کرد بگەڕێتەوە بۆ سیراکۆس،

هەستەکان جێبەجێ نابێت. ئەگەر بەڵێن وابێت کە رۆح بگاتە راستی دەبوایە بە جیهانی ئەزموون‌و هەست دووردەپەرێز بێت. لە حاڵێکدا کە ئەفلاتون سوور بوو لە سەر بڕوایە. لە پلەی یەکەمدا زۆر دژوارە تێبگەین کە بۆ گەیشتن بە دەوڵەتی ئامانجگەرای خۆی چ مەبەستێکی هەبووە. ئەم روانگە فەلسەفییە ناکۆکە لەگەڵ رێسای سیاسەتدا. سەرەڕای ئەمەش لە سەر بڕوای ئەفلاتون "کێشەکانی مرۆڤ کۆتایی نایەت جیا لەوە کە فەیلەسوفەکان زاڵ بن یان فەرمانڕەواکان حەز لە فەلسەفە بکەن." لە پراکتیکدا رێك پێچەوانەی ئەم دۆخە شتەکان هاتۆتە ئارا، ئەو فەرمانڕەوایانەی کە بیروڕای فەلسەفیی هاندەریان هەبووە، لە پێوانە لەگەل ئەو فەرمانڕەوایانەی کە لە فەلسەفە بێ ئاگان، زیاتر کێشەیان ساز داوە.

لایەنە ناسیاسییەکانی فەلسەفەی ئەفلاتون بۆ چەندین سەدە، کاریگەرییەکی زۆری لە خۆ بەجێهێشت. ئەم کارە بە گشتی بە هۆی ئەوە بوو کە فەلسەفەی ئەفلاتون بە باشی لەگەڵ مەسیحیەت دا تێکەڵ بوو، زیاتر دۆخێکی ژیرانەی بە مەسیحیەت بەخشی کە لە سەرەتاوە بنیات نرا. ئەنجامەکەشی ئەوە بوو کە ئیتر نەدەکرا حاشا لە مەسیحیەت بکرێت، دەبوایە ئەگەر ناڕاست بوایە بیانتوانیبا ناڕاستیەکەی بسەلمێنن.

بە بۆچوونی ئەفلاتون، رۆح یان ناخی مرۆڤ لە سێ بەشی جیاواز پێکهاتووە: بەشی ژیر کە لە ژێر سێبەری بیرمەندی‌و رۆشنگەری دا دێت. بەشی ئازایەتی کە بە دوای والابوونەوەیە، بەشی سێیەم هەروەها

فەیلەسوفە پیرەکە بە پاڵ کۆیلەکاندا کە لە ژێر قامچیدا بە ئازایەتییەوە سەوڵیان لێدەداو کەشتیەکەیان بۆ پێشەوە دەبرد، خێرا بۆ ئەوپەڕی دەریا واتە باوەشی پڕمتمانەی ئەسینا رۆیشت. پاش چەند ساڵی تر دیۆن هێرشی کردە سەر سیراکۆس کە گوایە مەبەستێکی لە پشتەوە بوو. دیونوسیۆسی دووهەمی لە سەر کار لابردو خۆی دەسەڵاتی گرتە دەست. کە بەخت هاوڕای دیۆن ببوو، ئایا دەیویست کۆمارییەکەی ئەفلاتون بنیات بنێت؟ نە، وانەبوو، بەڵام ئەگەری ئەوە لە ئارادا بوو لەوێ کە یەکسانیی ئەفلاتونی سەرنەکەوت، یەکسانیی شاعیرانە بە ئەنجام بگات: ئەوەندەی نەخایاند کە دیۆن لەوپەڕی سەیروسەمەرەییدا بە هۆی خیانەتی یەکێك لە قوتابیەکانی پێشوی ئەفلاتون کوژرا.

لەمڕۆوە دەرفەتی جۆراوجۆری ئەفلاتون لە چوارچێوەی سیاسەت کۆتایی پێهات. ئەمپراتۆریای رۆما بە ئەندێشە سیاسیەکانی ئەفلاتون پارێزرا. سەرەڕای ئەمەش بەرهەمی بیرۆکە تاقی نەکراوەکانی ئەفلاتون وابوو کە جیهانی سەدەکانی ناوەڕاست کە لە دڵی ئەمپراتۆریای رۆما سەریهەڵدا، نموونەیەکی لە بەر دەستدا هەبووبێت. لە سەردەمی ئێستادا بۆ نموونە: ئەستالین‌و هیتلەر بۆ کارەکانیان پیشینەیەکی دێرینیان هەبووبێت.

ئایا ئەفلاتون بە گشتی کەسێك بوو کە بە هۆی کەڵلەڕەقی پێداگری لە بیرۆکە ناڕاستەکان دەکردەوە؟ بە رای ئەو تەنها ژیری دەتوانێ بگاتە تێگەیشتنی راستەقینە یان ناسینی شتەکان، باوەڕی وابوو کارێکی وا بە

سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست. (تا ساڵی ١٩٦٦ چاپی نوێی "میوانی" بە فەرمی بە پێڕێستی کتێبە قەدەغەکراوەکانی کڵێسای کاسۆلیك دانرا).
ئەفلاتون، "ئەرۆس= خواوەندەخاتوونی خۆشەویستی لە یۆنانی دێرین= Eros)ی بە بزوێنەری رۆح بۆ لای خێر دادەنا. ئەرۆس لە خوارترین ئاستی خۆیدا لە خۆشەویستی ئێمە بۆ مرۆڤێکی جوانڕوخسار و مەیلەو نەمری کە لە رێگای لەدایکبوونی منداڵێك لە خۆی پیشانی دەدا، دەردەکەوت. هەرچەند زەحمەتە تێبگەین ئەم قسەیە چۆن لەبارەی ئالکیبیادیس پشت راست دەکاتەوە چونکە سوقرات روخسارێکی جوانی نەبوو، هەرگیز ئەگەری نەبوو لەم پەیوەندییە خۆشەویستیەدا کۆرپەیەکی هەبێت. شێوەیەکی والاتر لە خۆشەویستی گرێدراوی هاودڵییە لەگەڵ ئامانجە والاکانی ناخ، ئەم جۆرە خۆشەویستیە سەرچاوەی خێرو کۆمەڵایەتیە. والاترین دۆخی خۆشەویستانەی ئەفلاتون بە گشتی خۆشەویستی بەرامبەر بە فەلسەفەیەو لوتکەی ئەم خۆشەویستیە بە دەستهێنانی دۆخی باش و خێرە.

بیرۆکەکانی ئەفلاتون سەبارەت بە خۆشەویستی، کاریگەریەکی قووڵی لە خۆی بەجێهێشتووە. ئەم بیرۆکانە لە واتای خۆشەویستیی پاشایانەدا (یان خۆشەویستیی دەرباری= (Courtly love) کە هۆنراوەبێژانی (ترووبادۆر= Troubador واتە هۆنراوەبێژانو گۆرانی بێژە گەڕۆکەکانی فەرەنسا لە سەردەمی ١١ بۆ ١٣)، زۆر دڵیان دابوویە، بە ئاشکرا دیار بوو. تەنانەت هەندێ کەس سەبارەت بە بیرۆکەی

ئارەزووەکان بە دوای دامرکاندنی خۆیانن. سێکوچکەی سەرەکیی ئەو کۆمەڵگەیە کە ئەفلاتون لە کۆماریدا هێناویەتی، رەنگدانەوەی ئەم بەشانەیە: فەیلەسوفەکان یان ئەو کەسانەی کە جێبەجێکارن یان جەنگاوەرن، هەروەها چینێك کە تەنها سەرقاڵی بەزمو رەزمی خۆیانن‌و بیر لە چێژ وەرگرتن دەکەنەوە. ژیری بە سەر مرۆڤی کردەوە راست‌و یەکسانیخوازدا کاریگەری دەکات، سەرەڕای ئەمەش ئەگەر کرێکارەکان لە کارو ئارەزووەکانیان دەستیان بەر بدایەو لە بری ئەوەش هەوڵیان بدابا ببنە فەیلەسوف، وردە وردە پێکهاتەی گشت کۆمەڵگە تێکدەچوو. مەبەستی سەرەکیمان لەم باسانە ئەوەیە کە کردەوەی راست یان یەکسانی، تەنها کاتێك دێتە ئارا کە هەر سێ بەشی سەرەکیی رۆح ئەرکی تایبەتی خۆیان جێبەجێ بکەن، هەر بەوجۆرەش کاتێك یەکسانی لە وڵاتێکدا بە دەست دێت کە سێ بنەمای سەرەکیی کۆمەڵایەتی رۆڵی خۆی بگێرێت.

بیرۆکەی (میوانی)، چێژبەخشترین وتووێژی ئەفلاتون، باسی خۆشەویستی کردنە لە دۆخی جۆراوجۆردا. یۆنانیە دێرینەکان لە خۆشەویستیدا ئازاد بوون‌و گۆشەگیر نەبوون، بەشێك لە وتووێژی میوانی کە تیایدا (ئالکیبیادیس) دۆخی خۆشەویستی هاوڕەگەزبازیی خۆی بۆ سوقرات دەگێڕێتەوەو شرۆڤەی دەکات، واینواند کە ئەم بەرهەمە دوایی بە شێوەیەکی بەربلاو لە ریزی بەرهەمە قەدەغەکراوەکاندا ریز کراو بوو بە یەکەمین شاکاری ئەدەبی شاراوە لە

ئەسینادا رۆژانی باش‌و پشکواندنی بە سەر دەبرد تا دەرەنجام بە دەستی ئەمپراتۆریا یوستینین لە ساڵی (٥٢٩)ی زاینی بەربەستی بۆ داخرا. یوستینین هەوڵیدەدا بۆ سەرکوتی کلتۆری حاشاکردن لە ئاین کە لە لایەن یۆنانییە رەسەنەکانەوە هاتبووە ئارا و بۆ پاڵپشتی لە مەسیحیەت دەستی دایە ئەو کارە. زۆربەی مێژوونووسان، ئەم یادەوەرییە مێژووییە بە هێمای کۆتایی هاتنی کلتۆری یۆنانی- رۆمی داناوە کە سەردەمی تاریکی دەست پێدەکات.

ئەفلاتون لەبارەی ئەرۆس، گەلالە سەرەکییە خەون و خەیالە سێکسیە درەوشاوەکانی فرۆید دەبینن. ئەمڕۆکە سەبارەت بە واتای خۆشەویستیی ئەفلاتونی ئەوەندە کەم بووەتە کە ئەم دەستەواژەیە تا رادەیەك دەرخەری شێوەی لەناوچووی شەیدابوونی نێوان ژنان و پیاوانە. تەنانەت بیرۆکەکانی ئەفلاتون کە مەبەستی گەیشتنە بە لایەنی تێگەیشتنی جوانی و جوانناسیی ناخ، راستی و خێر بوو، لە حالێکدا بەشێکی زۆر لە شکۆداریی خەیالی خۆی لە دەست داوە. رەخنەگرەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە ئەم بیرۆکەیە بە گشتی وادەنوێنێت کە جیهان وەك زمان رۆڵ دەگێڕێت و بۆ وشە و دەستەواژەی جیاکراوە بە چوارچێوەیەکی والاتر دابنرێت. ئەم بیرۆکەیە ئەگەری هەیە هەڵە بێت، بەلام بە تەواوی نەماتوانیوە خۆمانی لێ رزگار بکەین. ئەفلاتون دەیوت جیهانی راستەقینە بەمجۆرەی ئێمە لە رێگای ئەزموون و زمان، لێی تێدەگەین و شیی دەکەینەوە، وانیە. بۆچی دەبێ وابێت؟ لە راستیدا دوورە کە شتێك وابێت، بەلام چۆن دەتوانین رۆژێ لە رۆژان لەوە تێبگەین؟

ئەفلاتون لە تەمەنی (٨١) ساڵی مردو لە ئەکادیمەکەیدا نێژرا. سەرەڕای ئەوەی فەلسەفەی ئەفلاتون بەوجۆرەیە، زۆربەی بیرۆکەکانی هێشتا لە روانگەماندا لە جیهان ماوەتەوە. ئەو نازناوەی لە ناوەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە، دەرخەری دۆخێکە لە راستی کە رۆژ بە دوای رۆژ دوورتر دەبێتەوە، ئەو خۆشەویستیەی کە رەنگدانەوەی بیرۆکەکانیەتی و پەیوەندیی لەگەڵیدایە. ئەکادیمەکەی ئەفلاتون لە

***پاشکۆی نەوتراو:***

وەك چۆن پاش سوقرات، قوتابیەکەی واتە ئەفلاتون هاتە گۆڕەپانی فەلسەفە، - رێك بە هەمان شێوەش پاش ئەفلاتون، قوتابیەکەی واتە ئەرەستۆ هاتە گۆڕەپانی فەلسەفە تا "سێ کەسایەتی والای" فەلسەفە بێتە ئارا، تا فەیلەسوفە گەورەکانی یۆنان تەواو بکەن. ئەرەستۆ لە کاتی بیرکردنەوەو دانانی بیرۆکە زۆرەکانی کە تایبەت بە خۆی بوون، بیرۆکەی ئەفلاتونی پەرە پێداو خستیە بەر رەخنە، لەم دۆخەدا فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆی خولقاند. سەرەڕای ئەمانەش فەلسەفەکەی ئەفلاتون بە شێوەیەکی رەسەنتر لە ئەکادیمەدا پەرەی سەندو لەوێ بە ناوی قوتابخانەی ئەفلاتون باوبانگی دەرکرد.

بە دەرکەوتنی ئەمپراتۆریای رۆما، ئەم قوتابخانە فەلسەفییە وردە وردە پەرەی سەندو لەم ئاراستەیەدا لایەنی جۆراوجۆری فەلسەفەی ئەفلاتون بەلاوە نرا. بە گشتی ئاشکرایە کە لە ئەمپراتۆریایەکدا کە چەند کەسێك وەك: (کالیگۆلا)و (نرۆن) فەرمانڕەواییان کردبوو، هەرجۆرە باسێك سەبارەت بە دەوڵەتی ئامانجگەرای سیاسی لە ژێری بە دوور بوو. بیرۆکەکانی تری ئەفلاتون وەك بۆچوونەکانی لەبارەی

بە یەخە بوون. بۆ ماوەیەك قوتابخانەی نوێ ئەفلاتونییان کردە قەڵخان لە بەرامبەر شەپۆلی گشتگیری مەسیحیەت دەژمێردرا.

بەڵام لە سەدەی چوارەمدا (ئاگۆستین)ی پیرۆز لە دایك بوو کە خەڵکی (هیپۆ) بوو، باشترین بیرمەندی فەلسەفەی سەردەمی ئەرەستۆ بە دواوە بوو. ئاگۆستین بە هۆی نەبوونی ناوەرۆکێك کە بە دوایدا لە مەسیحیەت دەگەڕاو نەیدەدۆزیەوە، دۆخێکی نیگەرانی هەبوو، ئارەزووی بەرەو قوتابخانەی نوێ ئەفلاتونی چوو. دەرەنجام بۆ ئاشتبوونەوەی فەلسەفەی ئەفلوتینی لەگەڵ ئیلاهیاتی ئورتودۆکس یان نەریتی مەسیحیەت توانی سەربکەوێت. لەوڕوەوە مەسیحیەت بووە بنەمایەکی ژیرانەی سەقامگیرترو پەیوەند درا بە قوتابخانە ئاڵۆگۆڕ بە سەر هاتووەکەی ئەفلاتون.

لەمڕوەوە قوتابخانەی ئەفلاتون (لە شێوە جۆراوجۆرەکانی خۆیدا) بووە بەشێك لە نەریتی مەسیحیەتو لە هەموو سەردەمەکاندا. زنجیرێکی لە بیرمەندەکان پێکهێنا کە باشتر لە خودی ئەفلاتون لە فەلسەفەکەی ئەفلاتون تێدەگەیشتن: ئەفلاتونیەکان، نوێ ئەفلاتونیەکان، ئاگۆستینی پیرۆزو هەندێ لەو بیرۆکانە لاینگری قوتابخانەی ئەفلاتون لە راستیدا تا خودی سەدەی بیستەم لە زانکۆ گەورەکانی ئەورووپادا بەتایبەت لە ئەڵمانیاو کەمبریج دا بەردەوام دۆخەکە هاوڕایان بوو، بەڵام لەم رۆژانەدا مێژوو لە سەر ئەو بڕوایەیە کە بەمشێوەیە بەرەو لەناوچوون رۆیشتووە.

بیرکاری بە تەواوی لە بەرچاو گیرا، چونکە رۆمیەکان ئەوەندە حەزیان لە بیرکاری نەبوو.

بە تێپەربوونی چەندین ساڵ قوتابخانەی ئەفلاتون وردە وردە ئاڵوگۆڕی بە سەردا هات. دەرەنجام رێژەیەك لە لاینگرە بەوەفاكانی كاربەدەستانی ئەم قوتابخانەیە، بەو ئەنجامە گەیشت كە هەرچەند فەلسەفەی ئەفلاتون پێویستە، بەڵام خودی ئەفلاتون زۆرجار ئەو شتانەی باسی لێوە دەكرد، لێی تێنەدەگەیشت. ئەم فەیلەسوفانە بڕوایان وابوو تا خۆیان لە قسەكانی ئەفلاتون تێبگەن. دەرەنجام لێكدانەوەیەكی نوێ لە فەلسەفەی ئەفلاتون هاتە ئارا كە بە ناوی قوتابخانەی (نوێ ئەفلاتونی) ناوی دەركرد. بە گشتی نوێ ئەفلاتونیەكان جەختیان لە سەر بنەمای ناخی قوتابخانەی ئەفلاتون دەكردەوە. ئەو شتەی ئەمانە بەو ئاراستەیەدا دەڕۆیشتن، بڕوایان بە زنجیرەی هاتنە ئارای كەونو هەبوون بوو كە كە زێدەڕۆیی دەستی پێدەكردو دەرەنجام دەچووە ئاراستەی خێر یان دۆخێكی تەواو.

گرنگترین نوێنەری قوتابخانەی ئەفلاتونی، ئەفلوتین(پلوتینۆس) فەیلەسوفی سەدەی سێیەمی زاینییە. لە شاری ئەسكەندەرییە خوێندنی تەواو كرد، مامۆستاكەی مەسیحیەكی لە ئاین وەرگەڕاوە بوو كە ببووە لاینگری قوتابخانەی ئەفلاتون، لەمڕووەوە هەندێ لە بیرۆكەكانی ئەفلوتین دۆخی مەسیحیەتی پێوە دیارە، بەڵام لە هەمان كاتدا مەسیحیەت و قوتابخانەی نوێ ئەفلاتونی لە هەندێ شوێنی ئەمپراتۆریای رۆما پەرەیان دەسەند، بە رادەیەكی دوورناپەرێز دەست

## نووسینەکانی ئەفلاتون

*فەلسەفە بە سەرسوڕمانەوە دەست پێدەکات.*

"تەیەتتۆس"

لەمبارەیەوە نموونەیەك هەیە پیشان دەدات بە چ شێوەیەك سروشتی مرۆڤایەتیمان رۆشنبیر ببێتەوە یان وەك خۆی لە نەزانیدا بمێنێتەوە. بارودۆخی مرۆڤەکان بەمجۆرە بێنە بەرچاو کە لە ئەشکەوتێکی ژێرزەویدا بە سەر دەبەن کە تا هاتنە بەر دەگای ئەشکەوتەکەو بینینی رووناکی، رێگایەی درێژ لە بەردەمدایە. مرۆڤەکان لە سەردەمی منداڵیدا لێرە بە سەریان بردووە، پێو ملیان وەها بە زنجیرەوە بەستراوە کە نەتوانن بجووڵێنەوە یان سەریان بۆ لای چەپو راستەکان بدەن، تەنها دەتوانن بەردەم خۆیان ببینن. والاتر و تۆزێ دوورتر لە پشت سەریانەوە ئاگرێکی گڕدار هەیە، لە ماوەی نێوان ئاگرو بەندکراوەکاندا رێگایەك هەیە کە بەو ئاراستەیە دیوارێك دانراوە، وەك پەردەیەك کە لە نمایشی شانۆی بووکەڵەکە، بووکەڵەبازی، لە دۆخێکدا کە بووکەڵەکان خۆیان لە سەر پەردە پیشان دەدەن، لە چاوی بینەران شاراوەن.

- ئەگەر لە کاتی هاتۆچوودا یەکێك لە رێبواردکان کە بە دوایانەوەن قسە بکەن، دیوارەکەی بەرامبەریان قسەکەی دەداتەوە، دۆخێکی سروشتییە کە بەندکراوەکان وا بیر دەکەنەوە کە ئەم دەنگە بە هۆی ئەو سێبەرەیە کە لە بەرچاویان دروست دەبێت.

وتی: سوێند بە زیۆس کە بە راستی وایە.

- لەورووەوە لە هەر بوارێك بەندکراوەکان وا بیر دەکەنەوە کە راستیەکان شتێکی ترە، جگە لە سێبەری ئەو شتۆمەکە دەستکردە.

وتی: بە دڵنیاییەوە وا بیر دەکەنەوە.

## *کۆماری، کتێبی هەشتەم*

کەواتە دەبێ وا ئەنجام وەربگرین کە پەروەردە وانیە کە هەندێ کەس بڕوایان وایە. پێداگریەکەی لە سەر ئەمەیە کە پەروەردە بریتیە لە ناساندنی ناخی مرۆڤ لەگەڵ ئەو ناسینەی کە پێشتر لە ناخدا بوونی نەبووە، وەك وابێت چاوێکی نابینا چاك دەکاتەوە.

- کەواتە، پێداگریان وایە.

- بەڵام باسەکەمان ئەوە دەردەخات کە شایستەیی ناسینی راستیەکان لە ناخی هەموو مرۆڤەکاندا سروشتێك هەیەو بارودۆخی ناخ بۆ بەدەستهێنانی ناسین وەك چاوێکە کە ناتوانێت بە تاریکایی بەرەو رووناکایی روو وەربگێرێت، جیا

وتی: ئەو شتەی کە وتت، دەتوانم وێنای بکەم.

- ئێستا وێنا بکە لە پشت دیوارەکە هەندێ کەس هەن کە هەموو جۆرە شتۆمەکێك وەك: پەیکەری بەردینو داریـنی مرۆڤەکانو ئاژەڵەکانو هەندێ شتی جۆراوجۆری تر لەگەڵ خۆیاندا دەگوازنەوە کە لە سەر دیوارەکەوە دیارە، هەندێکیان سەرقاڵی قسەکردننو هەندێکیشیان قسە ناکەن.

وتی: چ وێنایەکی سەیر دێنیتە بەرچاو، چەندە سەیرن ئەو بەندکراوانە بە زنجیر بەستراونەتەوە.

وتم: نە، ئەو بەندکراوانە نموونەی منو تۆن، چونکە سەرەتا وابیر دەکەیتەوە ئەم بەندکراوانە شتێکی تر نابینن جگە لەو سێبەرانە کە رووناکایی ئاگر خستۆیەتە سەر دیواری بەرامبەریان.

- چۆن دەتوانن لەمە زیاتر شتێکی تر ببینن، لە حاڵێکدا ناتوانن سەریان بۆ لای چەپو راست بسوڕێنن.

- ئەو شتانەش کە لە پشت سەریانەوە دەگوازرێتەوە، رێك هەر ئەم سێبەرە سادانەیە.

- هەڵبەت.

- ئەگەر ئەوانە توانایان بوایە پێکەوە قسە بکەن، ئایا کاتێك ئەو سێبەرانەیان دەبینیو باسیان لێوە دەکرد، وا بیریان نەدەکردەوە کە لە راستیدا سەبارەت بە شتۆمەکێکی راستەقینە قسەیان دەکرد؟

- بە دڵنیاییەوە هەر وایە.

*کۆماری، کتێبی چوارەم*

ژیری، ئەرکی وایە کە نوێنەرایەتی گشت ناخ دەکات و بە کەڵك وەرگرتن لە وردبینی و ئایندەبینین، فەرمانڕەوایی بکات، لە حاڵێکدا بەشی ئازاری ناخ دەبێ لە پلەی فەرمانوەرگر و پشتیوانی ژیریدا ئەرکەکانی جێبەجێ بکات.

کاتێك ئەم دوو بەشە بۆ تێگەیشتنی ئەرکە راستیەکانی خۆی پەروەردە کران و پشکوان، دەبوایە بۆ ئەوە ئامادە بوایان کە کونترۆڵ کردنی حەزو ئارەزووەکان گەورەترین بەشی ناخ پێکدێنێت و سروشتیان بە شێوەیەکە کە تێر ناکرێن و بە دەستی بێنن. دەبی بەردەوام ئاگامان لەم حەزو ئارەزوانە هەبێت تا ببنە رێگر لە بەردەم ئەم حەزو ئارەزوانە کە چێژی جەستەیی ئەوپەڕی چێژی خۆیان وەربگرن، لەمڕووەوە ئەوەندە قەڵەون کە تێر نابن تا دۆخێکی تر ئەرکی تایبەتی خۆی جێبەجێ نەکات بەڵکو لە بری ئەوە هەوڵبدات سەرانسەری بینای ژیان ئاڵۆگۆڕ بکات و بیکاتە کۆیلەی خۆی.

*کۆماری، کتێبی چوارەم*

لە خەومدا خەوێکم بینی و لەم خەوەدا پێم وترا کە لە قۆناخی یەکەمەوە کە هەموو شتێك لەوانە دروست کراوە بەتایبەتی من و تۆ، وەهان کە هیچ کەسێك ناتوانێت شرۆڤەیان بکات. دەتوانین بۆ هەر یەك لەم قۆناخانە ناوێك دابنێین: ئێمە ناتوانین شتێکی زۆریان بخەینە

لەوە کە هەموو جەستە رووی بۆ ئەو ئاراستە بگێڕێت. بەمشێوەیە سەرانسەری ئاخ دەبوایە لەم جیهانە کۆنو سێبەرئاساو گەندەڵە روو وەربگێڕێت تا چاوی بتوانێت وردە وردە خوو بە رووناکایی راستەقینەو درەوشاوەترین راستیەکان بگرێت کە ناوی خێر- مان لە سەری داناوە، هەروەها مواری ئەو رووناکاییە بکات.

*کۆماری، کتێبی هەشتەم*

*خواوەند، بە بێ هەڵەیە.*

*کۆماری، کتێبی پێنجەم*

لە بیر مەکە کە هاوڕایی خەڵك رێگایەکە بۆ بەختەوەری، لە کاتێکدا خوویو رەفتاری دیکتاتۆری لە بری هاوڕابوون گۆشەگیری بە دەمەوەیە.

*نامەکان، نامەی چوارەم*

یەکسانی لە مرۆڤدا وەك یەکسانیە لە کۆمەڵگەدا. نابێ لە بیر بکەین کە یەکسانی لە کۆمەڵگە بەو واتایەیە کە هەر یەکەمان لەو سێ چینەی کە تیایدایە، ئەرکی تایبەت بە خۆی ئەنجام بدات. هەر یەکەمان تەنها کاتێك دادوەرین کە هەر یەك لە بەشەکانی ژیانمان ئەرکی تایبەت بە خۆی ئەنجام بدات.

- کەواتــە زیــاتر لــەودی بــۆ یەکــەمین جــار هەنــدێ شــتۆمەك دەبینین کە تا رادەیەك پێکەوە یەکسانن، بە دڵنیاییەوە پێشتر تێگەیشتنمان لە یەکسانی هەبووە.
- وایە.
- لە هەمان کاتدا ئەوەمان بـەلاوە پەسـەندە کـە جگـە لـە ڕێگـای بینـین یـان بەرکـەوتن یـان یـەکێك لـە هەسـتەکانمان، وێنـای یەکسانیمان بە دەست نەهاتبێتو نـەمانتوانی بێـت بـە دەسـتی بهێنین. ئێستا من هەموو ئەم هەستانە وەك یەك دەزانم.
- سـوقرات بـەو مەبەسـتانە لـە باسـەکەماندایە، ئەمانـەش هـەر وان.
- لـەمرۆوەوە بـە دڵنیاییـەوە لـە ڕێگـای هەسـتەکانمانەوە ئاگامـان لەودیـە کـە هەنـدێ شـت تـا رادەیـەك یەکـسانن، بـە تـەواوی یەکـسان نـین. کەواتــە دەبــێ وێنایــەکی یەکـسانی تــەواومان هەبووبێت، ئەگینا پێوانەیەك لە ئارادا نابێت کە لەو ڕێگایەوە ئەو شتانەی بە یەکسان دانانین، پێکەوە پێوانەی بکەین.
- سوقرات! وادیارە ئەم قسەیە بە رادەی پێویست لۆژیکیە.
- بەڵام ئایا بە دڵنیاییەوە تەنها لە کاتی لـە دایکبـوون بـۆ جاری یەکــەم دەبیــنینو دەبیــستینو کــەڵك لــە هەســتەکانمان وەردەگرین؟
- هەڵبەت.

پـالّ. ئەگەر بمانـەوێت تـەنها بـاس لـە خـودی ئەوانـە بکـەین تەنانـەت ناتوانین بڵێن کە بوونیـان هەیـە یـان بوونیـان نیـە: چـونکە باسـکردنی هەنـدێ شـتی وا ئـەوە دەسـەلمێنێت کـە تایبەتمەندییـەکانی بـوون یـان نەبوونمان داوەتە پالّ.

ئێمە نـاتوانین هـیچ یـەك لـەم بەشـە سـەرەکیانە وەسـف بکـەین. تـەنها دەتوانین ناویان لێبنین، چونکە ئەوانـە شـتێکیان بـەم نـاوە نیـە، بـەلاّم ئەو شـتانەی لـەم رەگەزانـە پێکهـاتوون، لەگـەلّ تێکـەلاّوبوونیان لەگـەلّ هەنـدێ نـاو کـە لێکدانەوەیـەك پێکـدێنن، وەسـف دەکـرێن، چـونکە بەمشێوەیە ئاوێتەن: چونکە لێکدانەوەیەك بنەمای وەسفکردنیانە.

***تەیەتتۆس***

- وابیر بکەینەوە کە کەسێك شتێك ببینێـت یـان ببیسـتێت یـان لە شتێك تێبگاتو پاشان لـە بـەر خۆیـەوە بلّێـت: "ئـەو شـتەی من لێی تێدەگەم تا رادەیەك هاوشێوەی شتێکی ترە، هەرچـەند لـە راسـتیدا تـەنها نموونەیـەکی سـادەیە لـەوە." ئایـا بـە رای خۆمـان کەسـێك کـە ئـەم هەسـتەی هەیـە، نـابێ ناسـینێکی پێشۆتری بەرامبەر بەو "شتەی تر" هەبووبێت کە لە راستیدا ئەو شتەی تری بە بیر هاتبێتەوە؟
- هەلّبەت ...

دەڵێن سوقرات لە خەودا جووجەڵە قازێکی بینی کە لە سەر ئەژنۆکانی دانیشتووە. جووجەڵە قازەکە خێرا پەڕو باڵی دەرهێناو بوو بە قازێکی گەورە. ئنجا دەنگێکی بەرزی دەرخستو لە شەقەی باڵی دا. رۆژی دوایی سوقرات لەگەڵ ئەفلاتون لە نموونەی قوتابیەکدا یەکتریان ناسیو خێرا تێگەیشت کە ئەو قازە لە خەوەکەیدا بینیویەتی هەمان ئەفلاتونە.

***دیوگنیس لایەرتیۆس، ژیانی فەیلەیوفە ناودارەکان، کتێبی سێیەم، پێنجەم***

***ئەوپەڕی فەلسەفەکەی ئەفلاتونک:***

سەقامگیرترین بنەما ئەوەیە کە هەموو کەسێك چ پیاو چ ژن، دەبێ رێبەرێکیان هەبێت. هەروەها نابێ هیچ کەسێك بەم تایبەتمەندییەوە خۆ بگرێت کە شتێك لە سەر بنەمای داهێنانی کاری خۆی جێبەجێ بکات، چ بە راستی یان بە گاڵتەجاڕی. دەبێ ئەو کەسە هەم لە کاتی شەڕ و هەم لە کاتی ئاشتی دا، رێز لە رێبەرەکەی بگرێتو لە دڵەوە بە گوێی بکات. دەبێ بە رێزەوە سەیری رێبەرەکەی بکات، تەنانەت لە وردترین مەسەلەکاندا رێنوێنیەکانی بکاتە نموونەیەك بۆ خۆی. بۆ نموونە دەبێ لەو کاتانەدا کە فەرمانی پێکراوە لە خەو هەستێت، بڕوات بۆ ئەملاو ئەولا، خۆی بشواتو خواردنەکەی بخوات، بە

- بەڵام پێشتر لە سەر بیرۆکەیەك هاوڕا بووین کە دەبێ ئێمە پێش ئەوەی کەڵك لە هەستەکانمان وەربگرین، ئاگامان لە یەکسانی و نایەکسانی هەبێت، ئەگینا ناتوانین هیچ تێگەیشتنێکمان بەرامبەر بەوە هەبووبێت.
- وایە.
- ئەمەش بەو واتایە دێت کە ئێمە بە دڵنیاییەوە پێش لە دایکبوون، ئەم هوشیاریەمان هەبووە.
- وادیارە.
- لەمڕووەوە چونکە پێش لە دایکبوونمان لەم هوشیارە ئاگادار بووینەتەوە، ئەو کات کە لە دیك بووین ئەوەمان زانیوە، ئەمەش بەو واتایەیە نەك هەر بۆ یەکسانیو یەکسانی ڕێژەیی، بەڵکو هەموو پێوانە نەگۆڕەکانمان ناسیوە. هەر ئەم تێگەیشتنەش کە لەبارەی یەکسانیی تەواو بە کارمان هێناوە، هەر بەمشێوەش بۆ یەکسانیو جوانیی تەواو و خێری تەواو، گرێدراویی ئەخلاقیی تەواو و پیرۆزبوونی تەواو بە کاریان دێنین، بە ڕای من لەبارەی هەموو ئەم تایبەتمەندییانە کە ئێمە بۆ ئەوانە دەستەواژەی "تەواو" بە کار دێنین، ئەمەش دەرخەری ئەوەیە کە بە دڵنیاییەوە ئێمە پێش لە دایکبوونمان ئەم کارە تەواوانەمان ناسیوە.

فایدۆن

بۆ ماوەی چەندین سەدە، ئەگەری نەبوو کە ئەفلاتون هەڵەی کردبێت. لەو ماوەیەدا کە لە چوارچێوەی پارێزراوی لایەنگرانی کلاسیزم‌و زانایی ئیلاهیات دا مایەوە، لە ریزی هەندێ بیرۆکەی بێ مەترسی لەمشێوەیە مایەوە، جگە لەو کەسانەی کە لە روانگەی کەسانێك کە دەبوونە بەڕێوبەری خوێندنگە شەوانەییەکانی بلیمەتەکان‌و ئەم بیرۆکانە کە وەك گەڵاڵەیەك بۆ پەروەردەی سەردەمی ڤیکتۆریا بوو، جێبەجێ دەکران. تەنها لە نیوەی سەدەی بیستەمدا بوو کە (کاردڵ پۆپەر) فەیلەسوفی نەمسایی بەم ئەنجامە گەیشت کە کاتی ئەوە هاتووە کە پەتەی ئەفلاتون وەك فاشیزمێك بخاتە سەر ئاو. لەم کتێبەدا "کۆمەڵگەی کراوەو دوژمنەکانی= Open Society & Its Enemies) ئەنجامی دا کە ئەو قسانەی لای خوارەوە لەوە وەرگێراوە:

خۆباوەڕیی گرێدراو لەگەڵ هاوڕێیەتیدا، بووەتە بنەمای شارستانیەتی رۆژئاوامان. ئەم کارە، بنەڕەتی مەسیحیەتە ( کتێبی پیرۆز دەڵێت: " دراوسێکەت خۆش بوێت" نەك عەشیرەو تایفەکەت خۆش بوێ. هەوینی هەموو پەروەردە ئەو ئەخلاقەیە کە لە شارستانیەتماندا شانازیان پێوە کردووەو خوێنیان لە دەمارەکانی ئەم شارستانیەتەدا خستۆتە گەڕ، ئەفلاتون ماڤ ئەوەی هەبوو کە ئەم فێرکاریانە بە دوژمنی حکومەتی کەموکۆڕیی خۆی دابنێت، ئەو زیاتر لە هەموو فێرکارییەکانی سەردەمی خۆی رقی لە باوەڕ بە رووخاندن هەبوو.

واتایەکی تر دەبێ بە یارمەتیی دۆخی درێژخایەنی پەروەردە بەوەوە خوو بگرێت کە هەرگیز تەنانەت ئەو خەیاڵە بە مێشکیدا نەهێنێت کە بە شێوەی سەربەخۆ بجووڵێتەوە، لەمڕووەوە بە تەواوی بێزارە لە جێبەجێکردنی کارێکی وا. لەمڕووەوە هەمووان ژیانی خۆیان بە شێوەی هاوبەش تێپەڕ دەکەن. هیچ یاسایەك لەمە والاتر نەبووەو ناشبێت. ئەمە کاریگەرترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە رزگاری‌و سەرکەوتن لە شەڕدا. هەروەها لە کاتی ئاشتی‌و لە یەکەمین ڕۆژانی منداڵیدا ئەم یاسایە دەبێ وەك والاترین یاسا بمێنێتەوە: پێویستیی فەرمان کردن بە خەڵك‌و فەرمانوەرگرتن لە خەڵك. هەموو هێماکانی سەربەخۆیی یان ورەی دژە دەوڵەتی دەبێ لە ژیانی هەموو مرۆڤەکاندا تەنانەت ئاژەڵە دڕندەکان کە لە لای خەڵك دەپارێزرێن، بە تەواوی بنبڕ بکرێت.

***یاساکان***

ئەم قسانە بە شێوەیەکی مەترسیدار بۆ توێژەرانی (رایشی سێیەم) و ڕژێمە کۆمونیزمیەکان- هەر لە ڕووسیای ئەستالینی بگرە هەتا شۆڕشی کلتۆری، شتێکی ئاسایی‌و ناسراوە. وادیارە کە " زانستی سیاسەت"ی دیکتاتۆری پاش تێپەڕبوونی دوو هەزار ساڵ لە سەردەمی منداڵیی شارستانیەتمان، پێشکەوتنێکی زۆر کەمی بە خۆ بینیوە، ڕێك بەوشێوە کە ئەو دەروونناسیەی کە حکومەتێکی وا سازی دەکات، جیا لە قۆناخی منداڵیی گەشەو ئاڵۆگۆڕ، ئەوەندە پێشکەوتنی بە خۆوە نەبینیوە.

پێویست ڕێکخراون. ئەگەری نیە هیچ جۆرە ڕێسایەك باشتر بێت لە شێوەی والاتری حکومەت.

## ***یاساکان***

ئەمانە خۆ روانگەی گەنجێکی تازەلاو نیە، بەڵکو بیر وڕای فەیلەسوفێکی پیری بیرمەندە. "یاساکان" لە ریزی دوایین بەرهەمەکانی ئەفلاتوندایە. ئەگەری زۆری هەیە ئەفلاتون کاتێك ئەم کتێبەی نووسیوە کە بۆ جاری سێیەمو دوایین جار لە سیراکۆس گەڕاوەتەوە. ئەم بەرهەمە روخساری ئەفلاتونی لە سەدەی ناوەڕاست تا کۆتایی حەوتەمین دەیەی سەدەی تەمەنی دەرخستووە.

وادیارە زۆربەی لێکۆڵەران لەگەڵ ئەم روانگەیەدا ڕێکەوتن کە لە "یاساکان"دا (ئەفلاتون بە گۆڕینی دەوڵەتی ئامانجگەرایی کۆماری) هەندێ بەهای داوەتە ژیانی راستەقینە. "کاپلەستۆن": جیا لەم پرسیارە کە ئایا کۆماری ئەفلاتون جۆرێك دەوڵەتی ئامانجگەرایە یان نا؟ یان ئایا ئەمانە لە ریزی ئەو ژیانە راستەقینایە کە ئارەزوومانە یان نا؟ بە داخەوە کە حکومەتی دیکتاتۆریو هاوکات لەگەڵ پەیڕەوگەرایی(Conformism)و خوگونجاندنی بەکۆمەڵ زۆرجار بۆ ملیۆنان کەسی بەختەوەر بووەتە ژیانی راستەقینە، کە هێشتاش وایە، بەڵام بۆ زۆربەمان داشکاندنو ئەو خاڵە باشانەی کە دەمانەوێ ببینین کە لە کۆمارییەکەی ئەفلاتوندا بە ژیانی راستەقینە دراوە، لە شێوازێکی ترن.

هــەرگیز کەســێك پــەیا نابێــت شــێلگیرتر لــە ئــەفلاتون بێــت بــۆ دوژمنایەتی ئەو شتانەی کە بۆ تاکەکەسییە.

***پۆپەر، کۆمەڵگەی کراوەو دوژمنەکانی***

"پۆپەر" رستەی لای خوارەوە دەگێڕێتەوە کە ئـەفلاتون کۆمارییەکـەی بە (والاترین شێوەی دەوڵەت) ناو دەبات. ئەفلاتون لە درێژەدا دەڵێت: ژنانو منداڵان و هەروەها خزمەتکارەکان، کۆیلەکانو ئاژەڵە ماڵییـەکان بە داراییو سـەروەتی کۆمەڵگـە دەژمێـردرێن. بـۆ ئـەوەی هـەموو هێما ئەگەرییەکانی تـاکبڕوایی یـان ئـەو شـتانەی تایبـەت دێنـە بـەر چـاو لـە ژیانمـان بنـبڕ بکـرێن، لـە هـەموو جـۆرە کەرەسـەو ئامێرێـك کـە بـیری لێکدەکرێتــەوە کــەڵك وەرگــیراوە. تەنانــەت ئــەو شــتانەش کــە خــودی سروشــت ئەوانــەی بــە تاکەکەســیو تایبــەت دانــاوە، تــا رادەی پێویــست داراییە هاوبەشەکان بە هی هەمووان دانـراوە. هـیچ شـتێك تایبـەت بـە کەسێك نیـە: تەنانـەت وا دێتـە بەرچـاو کـە چـاو و گـوێو دەسـتمان وا دەبیـنـنو دەبیـستنو کـار دەکـەن کـە گوایـە نـەك بـۆ تاکـەکان بـەڵکو گرێدراوی کۆمەڵگەی هاوبەشن. هەمووان لە یەك دۆخدا دارێژراون، بە رێژەیەك کە تا ئەوپەڕی رادەی شتەکان هاوشێوەی یـەکترن. ئەوانـە لـە ستایشو لۆمەکردندا هاوڕاو یەکدەنگن. تەنانەت هەموویان پێکەوە لـە یەك کاتدا بە هۆی شتێکەوە خوشحاڵی دەردەبـڕنو بـە هـۆی شـتێکەوە خەمبارن. هەموو یاساکان بە مەبەستی رێکخستنی هاوڵاتیـان تـا ئاسـتی

هێشتا کە هێشتایە باون. بە واتایەکی تر بۆچوونە سیاسیەکانی ئەفلاتون بەو رادەیە نەمرن کە بەشەکانی تری فەلسەفەی نەمرن. وادیارە هیچ ڕێگەچارەیەك بۆ ئەم کێشەیە بوونی نیە. فەلسەفەکەی ئەفلاتون یەکێکە لە بۆچوونە گرنگەکانی شارستانیەتی رۆژئاوا کە بەردەوام واش دەبێت. ئەم سیستەمە فلەسەفییە هەندێ پرسیاری هێناوەتە ئاراو سازی داوە کە هێشتا فەلسەفە ڕووبەڕووی راوەستاوە، هەروەها بنەمای ژێریی بۆچوونی مەسیحیەت دابین دەکات. سەرەڕای ئەمانەش بۆچوونە کۆمەڵایەتیەکانی زۆر ئازاراوین. (وەك بڵێین هەموو کەسێك لەو سەردەمەدا وابیریان دەکردەوە، ئەوە بیانۆیەکی راست نیە، وانەبووە: ئەفلاتون لە ئەسینادا دەژیا کە بەخێوگەی دیمۆکراسیی بوو.) ئەگەر بمانەوێ قسەیەکی بەسوود بێنینە سەرزار، دەتوانین بڵێین: باشترین نمرە بدەینە بیرۆکە فەلسەفیەکەی و کەمترین نمرە بدەینە بیرۆکە سیاسەکانی.

"زۆر باشە. چونکە ئێوە شیاوی ئەوە نین کە بەرامبەر بە دەوڵەتی ئامانجگەرای من بژین، لە بری ئەوە جەهەنەمتان پێشکەش دەکەم." وادیارە ئەم قسەیە هەوێنی روانگەی ئەفلاتون بێت. بەوجۆرەی کە پێشتر وتم هۆکاری دەروونناسیو مێژووی سەیرو سەمەرەی هێنابووە ئارا، بەڵام سوودی فەلسەفە چییە کاتێک یەکێك لە خزمەتکارەکانی هەندێ بیرورای وا دێنێتە ئارا کە بە شێوەیەکی مەترسیدار رەنگو بۆنی بیری هەڵەی ئاوێتە بە دەمارگیریان هەیە؟ دەتوانرێت بەمشێوەیە هەڵبسەنگێرێت کە فەلسەفەکەی ئەفلاتون (وەك بۆچوونەکانی) لە پێش رۆژگاری خۆیەتی، لە حاڵێکدا بۆچوونە سیاسیەکانی زیاتر لە دۆخێکی خەیاڵاوی ئابۆس ئاسا نیە. لە راستیدا کەسێك حاشا لەم واتایە ناکات کە بۆچوونە سیاسیەکانی ئەفلاتون هەڵقوڵاوی سەردەمی خۆیەتی. ئەسینا لە بەردەمی هەڕەشەدا بوو، ئەگەر بیویستبا درێژەی بە ژیانی خۆی بدابا، دەبوایە ببوایاتە ئەسپارتێکی تر. (دەیەیەك پاش مردنی ئەفلاتون، مەکدۆنیەکان هێرشیان کردە سەر ئەسینا)، بە داخەوە ئەفلاتون کۆماریەکەی خۆی هەم بۆ کاتی شەڕو هەم بۆ کاتی ئاشتی دەخاتەڕوو، بۆ کاتی هەڕەشەو هەروەها بۆ کاتێك کە هیچ جۆرە هەڕەشەیەك لە ئارادا نیە، شتێك بە ناوی رۆژگاری گونجاو ئەگەری نەبوو لەم کۆمارییەدا بوونی هەبووبێت).

پەرەسەندنی ئەندێشە سیاسیە ناخۆشەکان، سنوردار کراو بە ناوچەی بچوکی بالکان نزیکەی دوو هەزار ساڵی رابردووە. ئەم بۆچوونانە

| | |
|---|---|
| ٥٢٩ی پ. ز | داخستنی ئەکادیمەی ئەفلاتون بە دەستی ئەمپراتۆریا پۆستینین هێمای کۆتایی سەدەی زانایی یۆنان. |
| ناوەڕاستی سەدەی سێنزدەهەم | تۆماس ئاکۆیناس شرۆڤەی خۆی بۆ ئەرەستۆ دەنووسێت. سەردەمی فەلسەفە لە خوێندنگەکاندا. |
| ١٤٥٣ی ز | رووخانی بیزانس بە دەستی تورکەکان، کۆتایی سەردەمی ئەمپراتۆریای بیزانس. |
| ١٤٩٢ی ز | کریستۆف کولۆمب دەگاتە ئەمریکا. سەردەمی نوێبوونەوە لە شاری بیزانس و زیندووبوونەوەی فێرکاری یۆنانی. |
| ١٥٤٣ی ز | کۆپەرنیك کتێبی "سەبارەت بە سوڕانەوەی گۆ ئاسمانیەکان" بڵاو دەکاتەوەو لە رێگای بیرکا ەوە دەسەلمێنێت کە زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێت. |
| ١٦٣٣ی ز | کلێسا، گالیلەی ناچار کرد بە فەرمی بیرۆکەی ناوەندگەرایی خۆر رەت بکاتەوە. |
| ١٦٤١ی ز | دکارت، "بیرکرنەوەکانی" خۆی بڵاو دەکاتەوە. دەسپێکی سەردەمی فەلسەفەی مۆدێرن. |
| ١٦٧٧ی ز | کتێبەکەی (ئەسپینۆزا) بە ناوی "ئەخلاق" پاش مردنی بڵاو کرایەوە. |
| ١٦٨٧ی ز | نیتوتۆن کتێبی "بنەما"ی بڵاو کردەوەو تیایدا |

*رۆژمێری رووداوە گرنگە فەلسەفیەکان:*

| | |
|---|---|
| سەدەی شەشەمی پ. ز | دەسپێکی فەلسەفەی رۆژئاوا بە بیرۆکەکانی (تالّسی ملەتی). |
| کۆتایی سەدەی شەشەمی پ. ز | مردنی فیساغۆرس. |
| ٣٩٩ی پ. ز | لە ئەسینادا سوقرات سزای مردنی بە سەردا دەسەپێنرێت. |
| ٢٨٧ی پ. ز | ئەفلاتون ئەکادیمەکەی خۆی بنیات دەنێت کە یەکەم زانکۆی دەژمێردرێت. |
| ٣٢٥ی پ. ز | ئەرەستۆ خوێندنگەی (لیسەیۆم) لە ئەسینا بنیات دەنێت کە رکەبەری ئەکادیمەیە. |
| ٣٢٤ی پ. ز | ئەمپراتۆریا (کنستاین)، ئەمپراتۆریای رۆما دەگوازێتەوە بۆ شاری بیزانس. |
| ٤٠٠ی پ. ز | سنت ئاگۆستین کتێبی (دانپێیادانەکان)ی خۆی دەنووسێت. فەلسەفە لە ئیلاهیاتی مەسیحی ئاسان دەکرێتەوە. |
| ٤١٠ی پ. ز | رووخانی ئەمپراتۆریای رۆما بە دەستی (ویزیگت)ەکان و دەسپێکی سەردەمی زولّم. |

| | |
|---|---|
| | مـردووە"، لـە شـاری تۆرینـۆ تووشـی تێکـچوونی دەروونی دەبێت. |
| ١٩٢١ی ز | وینگنشتاین "نامەی لۆژیکی فەلسەفی" خـۆی بـڵاو دەکاتەوەو شێلگێر دەبێت لـە سـەر ئـەوەی کـە بـۆ "دوایین ڕێگای چارەسەری" مەسەلە فەلسەفیەکان هەنگاوی ناوەو بە دەستی هێناوە. |
| دەیەی ١٩٢٠ی ز | حەڵقــەی "ڤییــەنا"، پوزیتیــۆزمی لــۆژیکی بــڵاو دەکاتەوە. |
| ١٩٢٧ی ز | "هایدگێر" کتێبی "هەبوونو کات" لە چاپ دەدات کـە باسـی جیـایی لـە نێـوان فەلـسەفەی شـیکاریو فەلسەفەی ئەوروپا دەکات. |
| ١٩٤٢ی ز | "سـارتێر" کتـێبی "هـەبوونو کـات"ی بیرۆکـەکانی هایـدگێر پاڵپـشتی دەکـاتو فەلـسەفەی ئەگزیستانسیالیزم دەخاتەڕوو. |
| ١٩٥٣ی ز | بڵاوکـراوەی کتـێبی "لێکۆڵینـەوە فەلسەفی"یـەکانی وینگنـشتاین پـاش مردنـی. لوتکـەی سـەردەمی شیکردنەوەی زمان. |

| | |
|---|---|
| | واتای راکێشانی شرۆڤە کردووە. |
| ١٦٨٩ی ز | (لاك)، "نامەیەك سەبارەت بە تێگەیشتنی مرۆڤ"ی بڵاو کردەوە. دەسپێکی سەردەمی فەلسەفەی بنەمای شیکردنەوە. |
| ١٧١٠ی ز | برەکلی کتێبی "بنەمای زانستی مرۆڤ"ی بڵاو کردەوەو بنەمای شیکردنەوەی بەرەو سنوری نوێ برد. |
| ١٧١٦ی ز | مردنی (لایبنیتس). |
| ١٧٣٩- ١٧٤٠ ز | (هیوم)، "نامەیەك بۆ سروشتی مرۆڤ"ی بڵاو کردەوەو بنەمای شیکردنەوە تا سنوری لۆژیکی گەیاند. |
| ١٧٨١ی ز | کانت بە یارمەتی هیوم لە "خەوی خۆویستی خۆیان هوشیار بووەتەوە"و کتێبی "رەخنەی وردی رەسەن" بڵاو دەکاتەوە. سەردەمی شکۆداری متافیزیای ئاڵمانیا دەست پێدەکات. |
| ١٨٠٧ی ز | هێگڵ کتێبی "دیاردەناسیی زەین" بڵاو کردووە کە لوتکەی متافیزیای ئەڵمانە. |
| ١٨١٨ی ز | "شۆپێنهاوێر" کتێبی "جیهان نموویەك لە ئیرادەو گێرانەوە" بڵاو دەکاتەوە، ئنجا فەلسەفەی هیندوستان لە متافیزیای ئەڵمانیا دەخاتەڕوو. |
| ١٨٨٩ی ز | نیچە بە راگەیاندنی ئەم بابەتە کە "خوا |

*رۆژمێری سەردەمی ئەفلاتون:*

| | |
|---|---|
| ٤٢٨ی پ. ز | پەرستشگەی پارتنۆن لە ئەسینادا ساز دراوە. |
| ٤٣١ی پ. ز | کۆمەڵەی ئازادی پیاوانی بەساڵاچووی ئەسینا دەگاتە (٤٢) هەزار کەس. (کۆمەڵەی کۆیلەکان دوو ئەوەندەی ئەم رێژەیەیە). |
| ٤٣٠ی پ. ز | مردنی فیدیاس، پەیکەرسازو نەخشەدانەری پارتنۆن. |
| ٤٢٩ی پ. ز | مردنی پریکلێس، فەرمانڕەوای ئەسینا لە سەردەمی ئالتۆنییدا. |
| ٤١٣- ٤١٥ی پ. ز | هێرشی سوپای ئەسینا بۆ سەر سیسیل کە دوایی تووشی شکست دەبێت. |
| ٤٠٨ی پ. ز | ئووریپید، ئەسینا بەجێدێڵێت. |
| ٤٠٤ی پ. ز | شەڕەکانی پولوپۆنزی بە سەرکەوتنی ئەسپارت بۆ سەر ئەسینا کۆتایی پێدێت. حکومەتی ئولیگارشی بۆ سەر ئەسینا زاڵ دەبێتو بە دوای خۆیدا تۆقینو ترس دێنێت. |
| ٣٩٩ی پ. ز | مردنی سوقرات. |
| ٣٨٤ی پ. ز | لەدایکبوونی سوقرات. |
| ٣٨٠ی پ. ز | مردنی ئاریستۆفانس، نووسەری سیناریۆی کۆمێدی. |

*رۆژمێری ژیانی ئەفلاتون:*

| | |
|---|---|
| ٤٢٨ ساڵ پ. ز | لەدایکبوونی ئەفلاتون لە ئەسینا، یان لە ئەگینا. |
| ٣٩٩ی پ. ز | ئەفلاتون پاش مردنی سوقرات لە ئەسینا هەڵدێتو دەڕوات بۆ باکووری ئەفریقاو ئیتاڵیاو رۆژهەڵاتی ناودراست. |
| ٣٨٨ی پ. ز | دەڕواتە کۆشکی دیونوسیۆسی یەکەم، فەرمانڕەوای سیراکۆس لە سیسیل. |
| ٣٧٨ی پ. ز | ئەکادیمە لە ئەسینا ساز دەدات. |
| ٣٦٧ی پ. ز | دەگەڕێتەوە بۆ سیراکۆس تا فێرکاری بۆ دیونوسیۆس بکات، بەڵام زوو بە زوو هەڵدێت. |
| ٣٦٠ بۆ ٣٦١ی پ. ز | بۆ جارێکی تر دەڕوات بۆ کۆشکی سیراکۆس. |
| ٣٤٧ی پ. ز | مردنی ئەفلاتون لە تەمەنی (٨١) ساڵیدا. |
| ٥٢٩ی زایینی | داخستنی ئەکادیمە بە دەستی ئەمپراتۆر (یوستینین)و دەسپێکی سەردەمی زوڵم. |

| | |
|---|---|
| ٣٦٧ی پ. ز | مردنی دیونوسیۆسی یەکەم، فەرمانڕەوای سیراکۆس لە سیسیل. کوڕەکەی واتە دیونوسیۆسی دووهەم لە شوێنی ئەو لە سەر تەخت دادەنیشێت. |
| ٣٥٣ی پ. ز | پاشا (ماوسولوس) واتە ساتراپی ئێرانیو فەرمانڕەوای کاریا لە ئاسیای بچوکدا دەمرێتو لە (ماوسولیۆن)دا دەینێژن. ئەم شوێنە لە ریزی حەوت شتە سەرسوڕهێنەرەکەی جیهان دادەنرێت. |

زنجیرە کتێبی
ناسینی فەیلەسوفەکان

نیچە
سوقرات
ئەریستۆ
ئەفلاتوون
سپینۆزا
ئاکویناس
ئاگوستینی قەدیس
دیکارت
سارتەر
کێرکگۆر
ئەینشتاین
هیگڵ
هیوم
ماکیاڤیلی
لایبنیتس
لۆک

## زنجیرە ناسینی فەیلەسوفەکان

ناسینی فەیلەسوفەکان زنجیرەیەکە لە ژیانی فەیلەسوفە بەناوبانگەکانو دەرگایەکی کراوەیە بۆ ناسینی بیروڕاو روانگەکانیان. لە هەر کتێبێك لەم زنجیرەیەدا جیا لە خستەڕووی زانیاری سەبارەت بە ژیانی فەیلەسوفەکان، بیرو بۆچوونی هەر فەیلەسوفێك لە پەیوەندی لەگەڵ فەلسەفەدا دەوترێتەوەو هاو ئاراستەیە لەگەڵ رووداو و گۆڕانکارییە هزریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکانی سەردەمی خۆیاندا. گرنگترین بیری فەیلەسوفەکان بە زمانێکی سادەو روون باس کراوە لە هەمان کاتیشدا لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی فەلسەفی وەرگیراوەو وردبینیەکی باشی لە سەر بووە. تازەپێگەیشتوانو گەنجانو هەموو خوێنەران کە فەلسەفەیان بەلاوە چێژبەخشە ئەم کتێبانە دەتوانێ هاوڕێو یارمەتیدەرێکی باش بێت بۆ جۆری بیرکردنەوەکانی. رەنگە ببێتە دەسپێکێك بۆ ئاڵوگۆڕ لە ژیاندا.




**کۆشك**

**فرانتس کافکا**

**بەم زوانە...**